





# زاری کرمانجی



# دەشتی قەراج و کەندیناوە



نووسینی

نیاز عەبدولقادر شەناغەیی

هەولێر - ۲۰۰۸

# زاری کرمانجی ی
# دەشتی قەراج و کەندێناوە

نووسینی: نیاز عبدالقادر محەمەد



# وەزارەتی رۆشنبیری

## بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە


- ناوی کتێب : زاری کرمانجی ی دەشتی قەراج و کەندێناوە
- نووسینی: نیاز عبدالقادر محەمەد
- نەخشەسازی ناوەڕۆك : نیان جمال & ئاری ئەحمەد
- پیت چنین : نەورۆز جمال & محەمەد زەنگەنە
- نەخشەسازی بەرگ: شێروان فاروق
- پێداچوونەوە/ صلاح شەناغەیی
- ژمارەی سپاردنی (١٩٧٧) ساڵی (٢٠٠٨) لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان پێدراوە .
- چاپ : چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری / هەولێر
- تیراژ : (١٠٠٠) دانە


[redacted]

((زمـان )) ئـەو تاکە ئەندامە هەستیارە ناسکەی مـرۆڤ بـووە کە هـەردەم حـەزو ئارەزووەکانی لـە کـاتی دەربـڕینی پـەیف و ووتـە شـیرینەکان ئاشـنای دەوروبەرەکەی کردووە و لە نەمان و وون بوون پاراستوونی.

لە هەمان کاتدا ڕۆڵێکی سەرەکی هەبووە بۆ لـە یـەکتر حـاڵی بـوون و پێشخستن و گەشـەکردنی سـەرجەم بوارەکـانی کـەلتوور و زینـدوو ڕاگـرتنی پـەیف و زاراوەکـان، هاوکات ئەمەش وا دەخوازێ کە پێویستی بە نووسینەوە هـەبێت و ببێتـە کۆڵەگـەی کەلتوور.

بێ گومان ئەگەر لەلایەنی (زمانەوانی)یەوە ڕۆبچینە نێوە دونیـای گەنجینـە بـە هادارەکانی ئەدەب و کەلتوری کوردیی خۆماڵییەوە باب و باپیرانمان هـەر لـە کۆنـەوە لـە ڕێگـەی ئـەو (( ئەنـدامـە)) وە تـەواوی بابەتـە فۆلکلۆرییـەکانیان بـە نـەوەکانیان گەیانـدووە لـە (ووشـەی پاراو و قسەی نەستەق و هەڵبەست و چیرۆك و شیعر و هۆنراوە و ئاوازی تـەڕ و بـەجۆش لـە ((مەتـەڵ و مەشکەهەژاندن و شـەنەباو شـەو دەستاڕو ڕەوسەکردن و ساوار کوتان و دروێنـەی بـەکرەیی و لای لایـێ و بـە للۆری و ەیارۆك و دەمە تەقێ و بووك گواستنەوە پەندو بەستەو گۆرانی و گاڵتـەبازی و زەم و نزاو ڕاو یاری و لاوك و حەیران و شایی و هەڵپەڕکێ و بێرەو ....هتد)

ئەمانــە یـان هــەموو ئاراسـتە کـردوون و سـەرجەم چـین و توێـژی کۆمــەڵگای کوردەواری یان پێ ئاشنا کردووە.

هەڵبەت شێوازی گفت و گۆکردن و دەربـڕینی هەموو ئـەو پـەیف و زاراوانـە لـە شـوێنێك بـۆ شـوێنێکی تـری کوردسـتان جیـاوازی یـان هەیـە و بـە زەقـی دیـارو بەرچاون، بۆ نموونە لە شارەکانی کوردستانی باشوور هەر شوێنێك بە پێی دەفـەری جوگرافیای خۆی جۆرە ئاخافتنێکی جودا لەیەك لە نێو پەیف و ڕستەکانیان بـەدی دەکرێ، ئـەوەتا لـە زۆربـەی ناوچـە جیاجیاکانی شـاری هـەولێر و دەوروبـەری ئـەم تایبەتمەندییەی پێوە دیارە.

ئەوەی لێرەدا مەبەستە بیخەمەبەر دیدی خوێنەرانی ئازیز ئەو کۆمەڵە ووشەو ڕستانەن کە کۆمەڵگای کوردەواری لە سنووری دەوروبەری دەشتی هەولێر بە تایبەتی ((قەراج و کەندیناوە)) بەکاریاندێنن، هەڵبەت گەر سەرنجیان بدەینێ دەبینین لە هەموو ڕوویێکەوە کرمانجەتییەکی ڕەسەنیان لێوەبەدی دەکرێ، ئەمانە هەمووی گەر گوزارشت لە شتێك بکەن بێ گومان گوزارشت لە دەوڵەمەندیی زمانی شیرینی کوردی دەکەن و گەنجینەیەکی بەپیت و پێزی ئەم میللەتە دەردەخەن. جا لێرەدا بە پێویستم زانی ((سەرجەم ئەو کۆمەڵە زاراوە کرمانجییەفۆلکلۆریانەی ئەو دەڤەرە)) کە بەشی هەرە زۆرینەی بوارەکانی لە خۆوەگرتووە ڕاڤەیان بکەم.

دوا پەیڤ:-

سوپاسی بێ پایانم بۆ هەموو ئەو هاوڕێ ئازیزو خۆشەویستانە بە گشت چین و توێژێکیانەوە کە یارمەتی دەرم بوون لەبەئەنجام گەیاندنی ئەو بابەتە.



- ئەلحەملای: (الحمدلله) ، سوپاس بۆ خوا.
- ئەشقیابوو: یاخی بوو.
- ئەشەدەمبیللا: ((أشهدبالله)).
- ئەو منداره مانگی گرت: بەو منداڵە دەگوترێ کاتێ تووشی ((ترس و بیم)) دەبێت
- ئەستێرك: نوێن.
- ئاوکوف: یەکسانی کوڕو کچ لە هەموو ڕوویێکەوە بەرلە هاوسەری بوونیان.
- ئاوقات: زۆرزان، لێزان، هاروهاج، ووشەیەکی تورکییە بە مانای (محامی، پارێزەر) دێت.
- ئامانەتی خوای بی: خوا ئاگادارت بێ.
- ئەو قسەی بەسەر دنیایێ مێخە: ئەم قسەیە بلاّو مەکەوە.
- ئەگەر ئەوها نەبوو بەو ناوەم گاس مەکە: شتی ڕاست و دروست دەگەیەنێ.
- ئەها کارکردە!: بە مرۆڤی کەتن کەر دەگوترێ.
- ئاو دزبووە: کاتێ مرۆڤ برینێکی بە شوێن لەشیەوە دەبێت بەر لە چاك بوونەوەی و تیمارکردنی ئاوی تیا دەخزێ و دەپەنمێ.
- ئەتوو بڕۆنێ ها؟! : تۆ سەیری کە، تۆ سەیری ناکەی؟!
- ئەعە: بەپیسایی منداڵ دەگوترێ، منداڵ بەکاری دەهێنێ.
- ئاخەبان: ژووری شارستانی، لە پێشا زۆربەی خانووەوکانی لادێ جەزیری بوون، بە دەگمەن خانوییێکی شارستانی دروست دەکرا.
- ئیبع: بەشتی پیس و قێزەوەن دەگوترێ، منداڵ بەکاری دەهێنێ
- ئیشی دیت: فێڵی لێ کرد، لێ ی سەند، لێی خوارد ، پێی نەهێشت

- ئەو مارەی لە زەواق نایە: ئەو مالّەی بێزار کردووە.
- ئەییەبا!!؟: چییە ئەوە!!؟، ئەی باوکە !!؟، بنچینەکەی (یایابە) ی عەرەبییە.
- ئامانە: پاسی نەفەر هەلگر.
- ئیستاپ: راوەستان، بۆ ئۆتۆمبیل، پایسکل و مۆتۆڕسکیل بەکار دێت، بنچینەکەی ((stop)) ی ئینگلیزی یەوە هاتووە.
- ئیسف ، ئسە: ناوی (یوسف) کورت کراوەکەیەتی.
- ئەممانە کینێ: بەلآم.
- ئارای وانی هەرگرتییە: وەکو ئەوان هەلّسوکەوت دەکات.
- ئەوەی هەرێ گەورەیان: گەورەیان، لە هەموویان گەورەتر.
- عانفەریم: ئافەرین.
- ئەنگۆ: ئێوە.
- ئۆی رەببی کورم لەبەر زگی داکت هەرگیرێی: دوعایێکی ئافرەتانە.
- ئەستەویر: هەرئاژەلّێکی مێیە ماوەی سالّێك نەزا پێی دەگوترێ ((ئەستەویر)) تا گژی زاووزێ کۆتایی دێت.
- ئاخە: ئاخر.
- ئاقاریان لەسەریەکە: سنوریان لەسەر ڕێرەوە، دوو گوند سنوریان لەسەر یەك ڕێرەوبێت.
- ئەتازە: ئێستاکە
- ئەومارە ئاوەدان بی: مالّت ئاوەدان بێت.
- ئەو محەلانەی: کاتێکی وەکو ئێستا؟
- ئەمەرەن جوس: پەت پەتێن ، یارییێکی مندالآنە.
- ئەو سندان کوشتییە: جوێنێکە.

- ئارو بۆر: بەو((شووتی یە))دەگوترێ کە تازە پێ دەگات، ڕەنگەکەی لە نێوان (سپی و سوور) ە.
- ئیشاعە: تیشک، بنچینەکەی (أشعە)یە.
- ئەژدیها: بە ماری گەورە دەگوترێ.
- ئەلعانەکینێ، ئەلعان: ئێستا، لە (الآن) ی عەرەبی هاتووە.
- ئاوزینگ: ١- (زین پای) ئەسپ سوار ٢- سەرە مەرگ.
- ئەسکورت: مل.
- بویتە قەنقە ناسك: کاتێ (نان) لەسەر ساج دەسوتێ.
- ئەفەندی: بە پیاوی فەرمانبەر دەگوترێ، ووشەیەکی تورکییە.
- ئاوزەی یەکدینە: هاو تەمەنن.
- ئەوجا برێ ئەو هاو ئەڤە: کاتێ شتێ یان کارێك ئەنجام دەدرێ .
- ئەو جا پێی ناوێ لە گەرەتوو: لەگەڵ تۆ بێ سوودە .
- بڕکۆکەك ، بڕۆکەك: هەندێك، کەمێك.
- بەتارو حەتار: بە تاڵ.
- باس و خواس : دەنگ و باس.
- بدە بەرێ: گوتنی قسەی بێ سوود.
- برێشکە: گوڵە بە ڕۆژەی برژاو.
- باڵتە: ١- شتی زۆر ٢- دەمەئاسنی پانی ڕاست و چەپی ژێر ئامێری (جەنجەڕە)
- بار تەڤای یەکن : وەکو یەکن ، یەکسانن.
- ئەددی!!: شتێك یان قسەیەك لە ڕاستی یەوە دووربێت ئافرەت بەکاری دەهێنێ.
- بەسەرە خۆی داشکاوە: تەریق بۆوە.

- بن پار: نزیك ، تەنیشت.
- ئایەغ: بە ئاژەڵی لاوازو بێ کەلك و خراپ دەگوترێ.
- ئاقر: عاقڵ، تێگەیشتوو.
- ئاگات لێی نەبڕێ: ئاگاداری بە، ئاگات لێی بێ.
- ئم: بەڵێ، ئا.
- ئۆدە: ١- ژوور، هۆدە ٢- بە داپیرە دەگوترێ منداڵ بەکاری دێنن.
- هەیرۆ: ئەیەڕۆ، کاتی قەومانی شتێك ئافرەت بەکاری دەهێنێ.
- ئاروو: خەیار.
- ئاخوور: شوێنی خۆراکی ئاژەڵە (ئالیکی ئاژەڵ)
- ئەتکی یان کردییە: عەیبدار بووە.
- ئۆخەی !: ١- کاتی دڵ ڕەحەت بوون و ئارامی مرۆڤە.

٢- مرۆڤ لە خۆشەویستییەوە بەرامبەر منداڵان بەکاری دێنن.

- ئەتوو عار نایینی؟: تۆ واز ناهێنی؟.
- ئینجازە: مۆڵەت بۆ پشوو، ((اجازە)).
- ئایش: ناوی ئافرەتە، (عائشە).
- ئۆمەر: ناوی پیاوانە، (عمر)ە.
- ئاگر گرتی: بە ئافرەتی ئارەزووباز دەگوترێ.

## ﴿ب﴾

- بینە بەرچاوی خۆت: وا دانێ، وامەزەندە بکە، بیهێنە پێش چاوی خۆت.
- بەهەزار ناری عەلی:  بەهەزار حاڵ، سوێندێکە.
- بەشەرم داکەتییە: بەکەسێك دەگوترێ لە شوێنێ شەرم بکات.
- بەسك: ناوی ئافرەتانە.
- بەرِك: گیرفان.
- بەبەر بای گێی کەتییە: بیستوویەتی.
- بە دەردی گۆتەنی:خۆی  ووتەنی.
- برِە بەرازی:  بە ئاژەڵی (بەرازی گەورە) دەگوترێ.
- بەرانی خوارد: کاتی جووت بوونی (بەران و مەرِ)ە.
- بن گەرِ: ژێر کەندەلان.
- بەرغەبابە: ژێر چەنە ((گەردن))ی مرۆڤی گۆشتن.
- بەنتك: لە قەنەفل و سۆتکە و زەنگیانە دروست دەکرێ ئافرەت بە یەخەی کوڵە جەبانەوە دەخەن بۆ جوانی.
- بزی پێوە کرد: دەستی لە سمتی دا.
- بە راگێرِە: بەلاَ گێرِەوەیە، کاتێ  کەسێك تووشی کارەساتێك دێ و دەربازی دەبێ.
- بەکاوەخۆ: بە هێواشی، لەسەرەخۆ.
- بەرسینچکە: نزگرە.
- بەهەشتاوی: بە پەلە، یەکسەر.
- بێ زەلەت: بێ تام، بێ لەزەت.
- بارِکە: تەمەنی پەلەوەر لە نێوان بچوکی  و گەورەیی دا.

- بێ عار: هاروهاج.
- بەکافرکوشتەنی: بە هیچ شێوەیەك، بە هیچ جۆرێك.
- بالیف: سەرین.
- بێیەغبار: هەژار، داماو، هیچ نەزان.
- بزرەبت: ڕاست و دروست، وایە، تەواوە، لە (بالضبط) هاتووە.
- بابۆڕە: پاروەنانێکی گەورە و لوول دراوە.
- بارانی چل عەسرە: زۆربەی کاتێ دەمەو عەسرەکانی وەرزی بەهار باران بە گەڕ (لێزمە) بێتە خوارەوە.
- بنەگینی: گیاییێکی دڕکاوییە، گوڵەکەی بچوکەو سپی ڕەنگە، شیلەی ئەو گوڵە باشترین جۆرە بۆ مێرووێ هەنگ، کە ڕووی ((دۆمبەلان))ی لە ژێرەوەی دەڕوێ، لە ناوچە زوورگ و شاخاوییەکان دەڕوێت، پاش تێکەڵ بوونی شیلەی ڕەگی ئەو گیایە لەگەڵ کەمێك ئاو (سیکۆتین)، (صمغ) دروست دەکات.
- بەرەژان: ئافرەت بەر لە منداڵ بوونی ژان بیگرێت.
- بەربۆوە: کەوتە سەر زەوی، بە ئەرزا کەوت.
- بە دەشتێ کەتییە: بە کەسێکی شێت دەگوترێ.
- بە شریکاتی: بە هاوبەشی، بە نیوەیی.
- بێژینگ: ساوەرو بروشی پێ دەبێژرێ.
- بەنازی ڕەسولەللاّ: سوێندێکە.
- بە خەزینەی وەنا: یەکێك شتێکی گران بفرۆشێ.
- بەبا هاتییە: کاتی جووت بوونی دێرە سەگ (مێ) و گۆرەی (نێر)
- بەفێ هاتییە: کاتی جووت بوونی تانجی نێرو مێ.
- بەکەر هاتییە: کاتی جووت بوونی نێرەکەرو ماکەر.

- بەرایی کێش: ئەو ئاژەڵەیە کە لە پێشەوەی هەموو ئاژەڵەکان دەڕوات.
- بزموك: ئەو دارەیە کە دەمی ((کاریلە)) ی پێ دەبەستریٚ تاوەکو نەتوانیٚ شیری دایکی بخوات.
- بازی بەند: وەکو (بازنە) لە قۆڵ دەکریٚ.
- بەردەقانی: ئامێرێکە شەڕە بەردی پێ دەکریٚ لە پەڕۆمووی ئاژەڵ دروست دەکریٚ.
- بەلازیمە: قەرەبوو و لەسەر نەمانی ئەو شتانەی کە لە فەرمانگەکان دەکەونە سەر مرۆڤ. بنچینەکەی (براءة الذّمة ) یە.
- بڕۆنە سوخەتی؟: تەماشای کردەوەی؟ کردەوەی ناشیرین و ناڕێك.
- بە قیبلەی پێغەمبەری: سوێندێکە.
- بە دوعا: لە بری (خواحافیزکردن).
- بالوکە: جۆرە نەخۆشیەکی پێستە لە سەرەوەی پەنجەکانی دەست و پێی مرۆڤ دەردەکەوێت، قەبارەکەی هێندەی دەنکە نیسکە.
- بە هەرەداوان: کەسێك (بەپەلە) بگاتە لات هەواڵێکی پێ بێت.
- بجێشت: بەهەشت
- بارە فڕە: باڵندە کاتێك تازە باڵ دەگرێت.
- بە عەزرەت: بە پەرۆش.
- باراش: دانەوێڵەی گەنم و جۆ، کردنی بە ئاردە لە ئاش.
- بەردەچەرخ: ماددەیەکی زۆر وورده لە مس دەچێت دەخرێتە ناو ئامێری چەرخ بۆ دروست بوونی تروسکایی ((ڕوناکی)) و دواتر داگیرسانی چەرخەکە بەکار دێت.
- بەلفە: فرت و فێڵ.
- بۆن و بەرامە: پەرش و بڵاوبوونەوەی بۆنی خۆش.

- بەردیل: ئەو ئاژەڵەیەساڵێك بەر لەوەی ببێ بە ((مەڕ)).
- بنیادەم: ئادەمیزاد، لە (بنی آدم) ەوە هاتووە.
- بەینەکە: ماوەیەکە.
- بە تەنێ: بە تەنیا.
- بەردبوارد: ئەو ئاژەڵەیە پێش ئەوەی ببێ بە (بەردیل).
- بۆن بڕ: بەو پیاوە دەگوترێ چارەسەری ئەو منداڵە ساوایانە دەکات کە (توشی بۆن کردن هاتبن)، بۆنیان کردبێ.
- بەربەسێری: جۆرە خواردنێکە.
- بەگم: ناوی ئافرەتانە.
- بەگیسی: ناوی ئافرەتە.
- بەسێ: ناوی ئافرەتە.
- بەسك: ناوی ئافرەتە.
- بنەوش: ناوی ئافرەتە، بنچینەیەکەی (وەنەوشە) یە.
- بەزگی دا: کەسێك خەم و خەفەتێکی زۆر هەڵگرێ و لە ناکاو بمرێ.
- بە گفت و لفت: بە مرۆڤی قسەزان دەگوترێ.
- بە هەندی هەر مەگرە: بە گرنگی مەزانە.
- بانگولە: جۆرە زیندەوەرێکە لە ناو سەری مرۆڤ و تووکی ئاژەڵ دا دەژی لەکاتی تەڤینی (ڕشك)پەیدا دەبێت.
- بوختان: تۆمەت خستنە پاڵ کەسێکە بە درۆ بێ ئەوەی کەسەکە ئاگای لەو تۆمەتە بووبێ.
- بەگەری کەوە: لەگەڵی دا بڕۆ.
- بێتامێ ساردوسوڕ: بەکەسێکی فشەکەرو گاڵتەچی دەگوترێ.
- بوزگوڕ: بەجل و بەرگ و کەل و پەلی وەك نوێن و بەتانی دەگوترێ.

- بێ عەدەب: بی ئەدەب.
- بەرپێنە: ١- ڕووەکێکی گیاییە ٢- یەکێك پێی بداتە بەرپێی یەکێکی ترو بەری داتەوە سەر زەوی.
- بێ حەشرو نەشر: جوێنێکە .
- باغە: پلاستیك.
- بەرەواژ: پێچەوانە.
- بەننایێ خوای: بەناوی خوا، سوێندێکە.
- بە خورامم بی: بە قوربانم بیت.
- بیژینە: بی هەژینە، وەك (لانك) هەژاندن.
- بەرامپیل: پارچە قوماشێکی بۆری چوارگۆشەیە، (تێلەکێش) لەخۆی دەپێچێ بۆ پاراستنی لە زبڵ و زار.
- برکی دەینی: شوێنێك یان ژوورێك زۆر گەرم دابێت.
- بوخچە: کۆمەڵە پەڕۆکێك لەشت و مەکی ناومالّ بخرێتە ناو پەڕۆیێکی گەورەوەو ئینجا گرێدانی هەر چوار لای.
- بە کوتەکان هەر ناستی: بە یەکێك دەگوترێ کە نووستبێ (خەوتبێ) و دواتر هەر چەندە بانگی بکەن لە خەو هەڵنەستێ.
- بەگوڕ: بە لێزمە، بەلێشاو.
- باپیر: ناوی پیاوانە.
- بە ئایەت: سوێندێکە.
- بۆرە زەلام: بە پیاوی بێکەلك دەگوترێ.
- بویتە مریشکی ئاوە ڕووتە: بەکەسێك دەگوترێ. ئاوە یان –باران، هەموو ئەندامەکانی لەشی تەڕکردبێ.
- بێزەوەر: قێزەوەن.

- بێزی لێ بۆوە : ڕقی لێ بوەوە، لە مرۆڤ و خواردن.
- بستەگوەکی بە قونێ وەیە: بەو مندالە دەگوترێ خۆی بە گەورە بزانێ.
- بەرەللا: جوێنێکە.
- بۆقێ: جوێنێکە.
- بیل ئەکس: پێچەوانە، لە (بالعکس)ەوە هاتووە.
- بچینە بانگێ: بڕۆین بۆ (تازیمانە)، (تعزیە).
- بچینە کۆڕێ: ئافرەت کاتێ بە کۆمەڵ دەچنە سەر (کانی) بۆ خۆشوشتن و جل شوشتن.
- بیژی: زۆڵ.
- بە قەستی : بە ئەنقەست.
- باداری: نەخۆشی ((ڕۆماتیزم)).
- بەعاستەم: کەم کەمە، بەهێواشی.
- بەگۆڕێ وەربوو: ١- ڕژا ٢- ئاشکرابوو ٣- پەرش و بلاو بۆوە.
- برند: بلند، بەرز.
- بەرکێبەگی: بە ماوەیەکی کەم.
- بەستەزمان: بێ دەسەلات.
- بە قالۆیەگی: بە ماوەیەکی کەم.
- بەتۆبزی: بەزۆری، زۆر لێ کردن.
- باول: جۆرە جانتایەکی کۆنە لە تەنەکەو دارو باغە دروست دەکرێ.
- بەپای پیلان خەرج دەکا: بەکەیفی خۆی خەرج دەکا.
- بێ مزەڕەت: ساغی و سەلامەتی، لەبێ (مضرّة) دوە هاتووە.
- بۆرژابوون: لە نێوان بە ئاگابوون و خەوتندا.
- بریا بە بریای خوای بوایە: خۆزگە.

- بەستر پێری: سێ ڕۆژلەمەوبەر.
- بە قوربانی سەو بەرازان بی: جوێنێکە.
- بەعەوای دەگەوی: پێویستی پێیەتی، حەزی پێیەتی.
- بادلۆ: بناغەی خانوو.
- بینت بارم بینت بۆرم: ئافرەت لەکاتی هەویر پان کردنەوە لە هێنان و بردن دەیلێن.
- بەبە: منداڵی ساوا، لە (baby) ەوە هاتووە.
- بیلامانایەکی: بەبێ مانا.
- بەسەر فێری کەتییە: لە فێڵی گەیشتووە.
- بن کر: چێینی ژێرەوەی شیری کولاوی ناو مەنجەڵ یان هەر جۆرە خواردنێکی تربێت.
- بنەبان: قورنە یان قوژبنی ئەو سەری ژووری خانوو.
- بێ سەرو بەر: بە کەسێك دەگوترێ ئاگای لە زۆر شت نەبێ.
- بووە قەترە ئاوەك: شەرمەزاربوو.
- بابان کۆر: سەرزەنشت کردنە، بە مانای (کەست نەمێنێ) ئافرەت بەکاری دەهێنێ.
- بۆرە: نازناوە بۆ گەلێ ناو وەك : شمس الدین، بهاء الدین، هەروەها هەندێ ناوی ئاژەڵیش لەوانە سەگ.
- برۆدوێ: بەردەوام بە.
- بیهاوێ بەر دری خۆت: کامەیانت پێ خۆشە، چۆنت پێ باشە.
- بەکاری خوی شك دێ: کەسێك تاوانێکی کردبێ و گومانیشی نەبێ کە تاوانەکەی ئەنجام دابێ.
- بەغار: بە مرۆڤی خێرا دەگوترێ لە غاردان.

- بەرانەکینێ: بەلاَم.
- باوو: جۆرە يارييەكە لەگەڵ منداڵی ساوا دەکرێ، ئاوڕدانەوەیە بەم لاو ئەو لا.
- باژۆ: لێخوڕە.
- بەعوببی در: پڕبە دڵ، بە حوببی دڵ.
- بوار: بەهار.
- بەرزەفت نابی: ناگیرێ، ڕاناوەستێ.
- بەشکو: بەڵکەم، بەڵکو، بەشکەم.
- بن پشك: ژن بە ژنی گەورە بەبچوك.
- بەرداوێ: زايينی ئاژەڵە بەرلەوادەی خۆی.
- برینگاندی: هەڵی پێچا، دوای باران بارین کاتێ هەور لە ئاسماندا پەرش و بلاَو دەبێت.
- بوخچەی بە دووکەتیان: بەو کچە یان ئافرەتە دەگوترێ کە لەکاتی بە دووکەوتنی (ڕەدووکەوتنی) لەگەڵ دۆستەکەی بوخچەیەکی بچووك لەگەڵ خۆی دەبات.
- بوویتە دەوەکی ڕووتی: بەکەسێکی بێ شەرم و دەم ڕووت دەگوترێ کە هەموو قسەیەکی بەسەر زاری دابێ.
- بەرەشنك: (بە دەمچە) جۆرە خواردنێکە، بەری ڕووەکی (شەواشینك)ە.
- بای دەستی وانیتی: جاران خەڵك لەو باوەڕەدابوون کاتێ کە تووشی جۆرە نەخۆشیەك دەبوون وەکو (لێدانی جەڵتەبەسووکی) یان نەخۆشییەکی ترسناك وایان دەزانی کە جنۆکە دەستی لە نەخۆش کەوتنی ئەو مرۆڤە هەیە یەکسەر ئەم دوعایەبە لێکدانەوەو بۆچوونی خۆیان (بای دەستی وانیتی) یان دەگوت تاوەکو مرۆڤەکە لە نەخۆشییەکە چاك بێتەوە.
- بەفشە: بە ئاسانی.



- پەناو پەسیو: شوێنی شاراوە، نادیار.
- پەسیو: نەخۆشی ((هەلأمەت)).
- پژمل: پشتەمل.+..
- پیرخەنی: وورده ساوار، جۆره خواردنێکه.
- پەرژین: درك و داره له دەوری باخچه و ڕەزدا دەچەقێنرێ بۆ پاراستنی له ئاژەڵ.
- پێ بلقە: پێ پلیکانە، پەیژە.
- پۆشتە: بەکەسێك دەگوترێ جل و بەرگی ڕیك و جوان بپۆشێت.
- پنج: جۆرێکه له گیای (تۆڵەگە) گەلاکەی وورده و لاسکەکەی باریکە، دەشخورێت.
- پیرەکەترە: بە ئاژەڵی پیر دەگوترێ کە هێزی لەبەردا نەمابێ.
- پەرتەی لێکەن: بلأوەی لێ بکەن.
- پێیەك لە پێشترە: خزمێکی نزیکترە.
- پشتەو شکێن: بە کەسێك دەگوترێ بەلای پشتەوەی خۆی دا بکەوێ و بەربێتەوە.
- پێیەك هێوەتر: کەمێك یان تۆزێك لەم لاوە.
- پێ دەکەوتەوە: دەیناسێتەوە، دەیدۆزێتەوە، شارەزایی دەبێت.
- پشتەك: کاتی برینەوەی خوری مەرە، هەندێك موو (تووك) ی لەسەر پشتی دەهێڵنەوە بۆ جوانی .
- پەرۆشە: جۆرە گیاییێکە، گەلاکەی گەورەو پانە، دەخورێ.

- پەنگاوەی دایتەوە: گردبوونەوەی ئاوی پیس و خاوێنە كاتێ مەزراكان دەگیرێن.
- پارچەرە: بە منداڵی تەمەن بچوك لە (١٠-١٤) ساڵان دەگوترێ.
- پێ قایل نییە: پێ رازی نییە.
- پەلە قاژە: نزیكە مەرگ.
- پیل: قۆڵ، هەنگڵ، نێوان شان و ئەنیشك.
- پیشەڤان، فیشەڤان: ئامێرێكە گیای ((كەنگرو و كاردی )) پێ هەڵدەكەنرێ.
- پەرە: پەڵە، تێرئاوبوونی خاك بە ئاوی باران.
- پەرێ: ناوی ئافرەتانە.
- پشی هەرما: تەنگە نەفەس بوو.
- پێنجوكانێ: جۆرە یارییێكی منداڵانە بە ((ە)) بەرد دەكرێ.
- پزدووك: دەرچوونی زیپكەیە لە لێوارەكانی برژانگی چاوو و دەوروبەری.
- پەتكەكی بەرداوە: بە كەسێك دەگوترێ قسەیەكی بێ سوود و قۆڕ بكات.
- پەل بەست: قۆڵ بەست.
- پەست: ١- پاسێكی كۆنە بۆ گواستنەوەی هاووڵاتیان لە نێوان شارو دێهاتەكان بەكاردەهێنرا.

٢- دڵ تەنگ.

- پێراو: پێڵاو، كەوش.
- پێی رەتی برد: ساتمەی كرد.
- پڕی زگی قسەیە: بە منداڵی بچووك دەگوترێ كاتێ تازە فێری قسە دەبێ و ناتوانێ بەباشی ڕستەكان دەربڕێ.
- پلوسك: بەلوعە.
- پەلار: ١- تانەو توانج ٢- هەڵدانی بەرد بە دەست.

- پێشاو: ئاو دەست ، سەر ئاو، ئەدەبخانە.
- پزدان: کاتێ ((بەرخ)) لە سکی دایکی دێتە دەرەوە دواجار دامەنی پڕ دەبێ لە (لیقاو) و (خیزاو).
- پۆقلە: کاتێ چینی سەرەوەی پێستی مرۆڤ دەسووتێ دوای ماوەیەك دە ئاوسێ.
- پێمەرە: ئامێرێکی زەوی کێلآنە.
- پخی گرد: سەری برِی.
- پەنمایە: ئاوساوە.
- پازپازۆکێ: یاریەکی منداڵآنە، بازدان.
- پشکی تێدا نەمایە: هیچی تیا نەماوە.
- پەککفوو!: ووشەیەکی سەرسوورمانە.
- پەرەگەی عاسمانێ: لووتکەی ئاسمان.
- پاکانەی لۆخۆی دەکا: پاساو بۆ خۆی دەهێنێتەوە.
- پەرۆو پار: کۆنە پەرۆ.
- پۆپیتە: پۆپنە.
- پشتە رِەقە: یارییەکی کۆنی کوردەوارییە دووکەس پشتیان بەیەکترەوە دەنوسێنن ئینجا هەر جارەی یەکێکیان بەنۆرە ئەوی تر دەجوڵێنێتەوەو دەڵێت:- پشتە رِەقە به تەق تەقە داکت چی بووە مندارەکی بووە ناوی چییە ناوی عەلییە
- پووش قاقەز: کۆلارە، یارییەکی منداڵآنە.
- بەردەباز: بەو (بەردانە) دەگوترێ کە لە ناو جۆگە و ڕووبارەکان دادەنرێ بۆ ئەوەی خەڵك بەسەری دا برۆن و بپەڕنەوە.
- بەیار: (زەوی) بەر لە کێلآنی.

- بژار: خاوێن کردنەوەی قەرسیلەی لەگیاو گۆڵ و دڕك و دار.
- بدەوە ئەو لایە: ئەم لایە بگرە، شوفێر بەکاری دەهێنن.
- بەهاری: گەنمی بەراوە.
- بوزی : قوماشی چۆغە، شاڵە.
- بەرەد: دەرد.
- پاروو: بریتییە لەو گوریسەی لە ژێر کلکی گوێ درێژ قایم دەکرێ بۆ ئەوەی کورتانەکە بۆلای ملی گوێ درێژەکە شۆڕ نەبێتەوە.
- پاك لە پاك: یەکسان بوون، کەس لەکەس.
- پەقرەج: سەتڵ.
- پردەیی: بە خەڵکی شارۆچکەی پردێ ((ئاڵتون کوپری)) دەگوترێ.
- پەلاپیسە: سەرووی دانەوێڵە کاتێ لە بێ بارانی و ووشکانی زەرد هەڵدەگەڕێ.
- پاردەوە: پاڵکەوە.
- پەلەواژ بۆوە: مرد.
- پیاوم دەوێ برێ لەل: مرۆڤ لەکاتی شەڕدا بەخۆهەڵکێشانەوە بەکاری دەهێنێ.
- پێ برکان: قلیشانی نێوان کەلێنی پەنجەکانی دەست و پێی مرۆڤە.
- پرماندن: لەکاتی قسەکردن خۆراك لە ناو دەمی مرۆڤەوە لە پرێکا بێتە دەرەوە.
- پژدێن: پشتێن، پشتپێن.
- پرتۆخ: پیس.
- پففە: چێشت، منداڵ بەکاری دەهێنێ.
- تازەبەتازە: شتێك لەوادەی خۆی تێپەڕبووبێت و بەسەر چووبێت.

- پەرەم بە پەرەم: هەپرووون بە هەپرووون.
- پیتۆر: بەکەسێکی لەخۆبایی بوو دەگوترێ.
- پێکی کە: بەشداری پێ بکە.
- پیك: ١- لاسکی گەنم و جۆیە ٢- پیکی جوزەللە کە ئامێرێکی مۆسیقییە.
- پیپ: بەرمیلی نەوت.
- پەرێز: ((زەوی)) لەکاتی دروێنەکردن و کۆتایی دروێنەدا.
- پالە: سەپان.
- پوخت: رێك و جوان.
- پێ هەگرە: خێرا برۆ.
- پاك لەمە: سالأنە کاتێ (کارێز) خاوێن دەکرێتەوە لە مانگی (٢) تا مانگی (٥)...
- پشتەوشار: لە رادە بەدەر.
- پەرکۆی کرد: هەمووی خوارد، هیچی لێ نەهێشت.
- پەل: ١- بە مرۆڤی شەرانگێز دەگوترێ ٢- قۆڵ.
- پتك: بەش، کەمێك.



- ترەکی یە: کاتی زایینی سەگ و پشیلە و تانجی و ....هتد.
- تیغ: بریتییە لە چەقۆ و خەنجەر دەمی تیژ.
- تێلەگە: بارێکی سووک و قەبارە گەورەیە لە پووش یان قەسەڵ ئافرەت بە کۆڵ هەڵی دەگرێ.
- تەغار: پێوانەیەکە ((٤٠)) ڕبە بۆ دەغل پێوان بەکاردێ.
- تام سۆ: بریتییە لەشیری زۆر کولاو پاشان کە بوو بە ماست تامێکی خۆش دەبەخشێت.
- تۆیف: ئەم ووشەیە بۆشتی جوان و بەرچاو دەگوترێ.
- تروتۆپ گەورە: بە کەسێك دەگوترێ بە هەموو شتێك ڕازی نەبێ.
- تەپکە ڕیخ: تەپاڵەی ئاژەڵە وەك :- گا- چێڵ..
- تەنگە: پەراسوو.
- تر زەمبۆ: بە پیاوی چوار شانە دەگوترێ و لە هەمان کاتیش دا تەمبەڵ بێ لەکارکردن دا ((هیچ کارێ نەکات)).
- تـوززاوە: هەسـت کـردن بـە ئازارەکـانی کـاتێ پێکـەوتنی یـان لێـدانی شەپازللەیەك.
- توخمەسە: جوێنێکە.
- تەسمیل بوو: خۆی دابەدەستەوە، ((تەسلیم)) بوو.
- توررەهات: جوێنێکە، هیچ و پوچ .
- تاریك و تونەك: شوێنێکی تاریك.
- ترخێنـە: ((سـلق و گـەنم و دۆ، تێکـەڵ بەیـەك دەکـرێ ئینجـا دەکـوڵێنرێ دواجار بە ساردی دەخورێ.

- تازە: ١- ئێستا ٢- نوێ.
- تێی تەقاند: هەڵات، بۆی دەرچوو.
- تۆزبەری عاسمانێی گرتییە: كاتی بەرپابوونی شەڕ یان كێشەیەك شوێنەكە ئاڵۆزی بە خۆیەوە ببینێ.
- تەپان: ژێر ژێرەوە.
- تەق و لۆق: نەمری و نەژی، ژیانێكی بە زەحمەت بەریتەسەر.
- تارمایی: سێبەر.
- تام گێل: كەم عەقڵ.
- تاریكە سەلات: تاریكی.
- توێڕی: جوێنێكە، خوێڕی.
- تەرس: پیسایی ئاژەڵ.
- تریتەو ماست: جۆرە خواردنێكە لە ((تێكۆشەی نان و ماست و ئاو)) دروست دەكرێ.
- تەیارە شكێن: ئامێرێكی سەربازییە، دۆشكە.
- تۆركە: تۆڵەگە، گیایەكی بەهارییە دەخورێ.
- تیتك: كەزی.
- تەویلە: ژووری ئاژەڵ.
- تەن بەتەن: شەڕكردنی دوو كەسە لەگەڵ یەكتری بە تەنیایی.
- تیلاك خوار: بەو كەسە دەگوترێ جامانەكەی بەلاری نابێتەوە ((ببەستێ)).
- تێی هەر سووە: سواقی بدە.
- توولەسە: تووتكە سەگ.
- تەبارە: بەو چینە گەنم و جۆیە دەگوترێ كە چاندراوەو شین بووە.

- تەورداس: ئامێرێکە داری پێ پەل دەکرێ دەمێکی تیژی هەیە لە دار یان لە ئاسن دروست دەکرێ.
- تەڕەساز: خواردنێکە لە ((شێلم و گەنمەکوتا و هەویریش دروست دەکرێ.
- تی تی تی تی : جۆرێکە لە بانگکردنی پەلەوەر.
- تریقەی پشتێ: ناوەڕاستی پشتە.
- تلی لی لی : هەلهەلەیە.
- تەسك و تریسك: جل و بەرگی تەسك.
- تامەزرۆ: پەرۆش، ئارەزوو لێبوون، مەراق.
- تفەنگ: ئامێرێکی جەنگە.
- تیرۆگ: ئامێرێکە لە دار دروست دەکرێ، هەویری پێ پان دەکرێتەوە.
- تاق و لۆق: تاك تاکە.
- تو ئەو خوایە!؟: بڵێ بە خوا!.
- تازیمانە: پرسە، تازیە، لە (تعزیە) هاتووە.
- تەپرەك: هۆڵی ئاژەڵە.
- تۆقی: ترسا.
- ترپاتی لێ بڕی: هیچی لێنەهێشت.
- تەشکەبەڕە: بەڕە ((ڕایەخ))ی کورت.
- تاژی: تانجی.
- تێڕکە: بەسەر پشتی گوێ درێژ دادەدرێ و هەردوو دیوی شتی تیا دەکرێ.
- تیسکە خوری: کەمێ خوری.
- تەرە: تەڵە.
- تخونی مەکەوە: نزیکی نەکەوی.
- تۆغیانیتی: ئەو پەڕیەتی.

- تێك قژ قژاینە: گردبوونەوەی خەڵکە لە ناو یەك.
- تەشکەر: دامەنی مرۆڤ.
- تەڕو هیشکانێ: تیروپشك.
- تیتڕواسك: جۆرە باڵندەیەکە ڕەنگی سپی و ڕەشە.
- تولقانەوە: گوشران، نەرم بوونەوە.
- تەقەت کردن: مردوو نێژتن.
- تورانەوە: تەریق بوونەوە.
- تێ ی ڕاکرد: لێ ی بردە ژوورەوە.
- تێ تڕییە: کەوتووە، سەرنەکەوتووە.
- تیلمە نان: پارچە نان.
- تەئهوو وەئهوو: بۆ بێزاری دەربڕین بەکاردێ.
- تەشی: ئامێرێکی خوری ڕستنە لە دار دروست کراوە، ئافرەت بە دەست بەکاری دێنێ.
- تێك و لێك چوو: تێك چوو، خراپ بوو.
- تڕتڕۆکی پسایە: بەکەسێکی تڕکەن دەگوترێ.
- تیرەکی دێ: منداڵان لەکاتی (ماتانێ) (کە لایانێ) بەیەکتری دەڵێن، نزیکی کەرەوە.
- تۆپی: بە ئاژەڵی مردوو دەگوترێ.
- تەدارك: کەل و پەل.
- تێ ی چەقی: لێ ی گیر بوو، چووە ناوەوەی.
- تێك ئارۆسکایە: شتێك بە ئاڵۆزی لە ناویەك گیر بێ.
- تالیق: تیروتوانج، لە (تعلیق)دوە هاتووە.
- تامپۆن: بەیەکدا کەوتنی دوو ئۆتۆمبیل یان دوو کەس.

- تفی باوێی لە هەوای دەیبەستی: مەبەست لە کەش و هەوای زۆر ساردە.
- تیاترۆ: ئافرەتی زیناکەر.
- تەڕە حەلوا: خواردنێکە.
- تێرنەخۆرە گاسی کردییە: بە کەسێکی زۆر خۆر دەگوترێ.
- توالێت: قاقول، داهێنانی پێشەوەی سەرە.
- تاتی: بە منداڵی ساوا، دەگوترێ کاتێ بیەوێ لەسەر پێ بڕوا.
- تۆتی کە: دانیشە، بە منداڵی ساوا دەگوترێ.
- تامیسکە: بریتییە لە بریندار بوونی دەوروبەری لێوی مرۆڤ کە بەهۆی دیتنی خەونی ناخۆشەوە دەردەچێت.
- تەنگاو: ١- بە کەسێك دەگوترێ لە ناکاو پیسایی بێت، ٢- شپرزە، شلەژاو.
- تۆقەسەر، تەوقە سەر: تەپلی سەر.
- تەقی کرد: دڵی تەقی.
- تخوب: سنوور.
- تشتۆیەکە؟ یەکێکی چۆنە؟!
- تاخچکە: ڕەففە، لە دیوار قایم دەکرێ و شتی لەسەر دادەنرێ.
- تەڕە بیرۆ: نەخۆشییەکە: دووچاری پێستی مرۆڤ دەبێت.
- تەگەی خوارد: کاتی جووت بوونی (( تەگەو بزنە)).
- تانی لە خۆی دا: خۆی سازدا بۆ هێرش کردنە سەر دوژمن.
- تاسولقە: قوڕی سوورەوە کراو کاتێ ڕەق دەبێت.
- تەگبەند: ووشەیەکی لێکدراوە لە (تەنگە+بەند) پێك هاتووە جۆرە قایشێکی پانە.
- تێکەت: دۆڕا.
- تیخ تیخەیَ دا: هانی دا.

- تەتۆکە: شووشەی ووردو خاشکراوە کە منداڵان یاری پێ دەکەن.
- تەمۆخ: تاوێر، بەردی مردە، بەردێك لەکاتی بەکارهێنانی دا هەڵبوەرێت و پارچەی ووردی لێ بەربێتەوە.
- تاخچە: دارێکە لە دیوار دەردێ بۆ لە سەردانانی ووردەواڵەی ماڵ.
- تالوکە: بە کەسێکی زۆر بلێ دەگوترێ.

## «ح،چ،ج»

- جۆخین، خەرمان: کۆکردنەوەی کەلاویَژ شارا.. لەسەریەك.
- جەنجەڕ: ئامێرێکە بە هۆی وولاغەوە دەسوڕێ قرشە دەکوتێ بۆ ئەوەی دانەوێڵە لە (کا) جیابکاتەوە.
- جەربەزە: بزێو.
- جەلە: جۆرە هۆنینەوەیەکی قەراغەکانی جامانەیە.
- جلیت: ئەو دلۆپە ئاوانەن کە بە گوێسوانەکاندا شۆڕدەبنەوەو لە ساردیانەوە دەیبەستن.
- جێ و بارینگان: جێگای نوستن.
- جۆنی: چاڵێکە، لە دار یان لە بەرد هەڵدەکەنرێ وەکو (هاوەن) (ئاون) دانەوێڵەی لەناو دەکوتن (دەهاڕن).
- جوایەز: جیاواز، جودا.
- جەزمە: پێڵاو.
- جەردە: ڕێگر.
- جەعە: کورت کراوەی ناوی (جەعفەر)ە.
- جەڕە: گۆسکە.
- جەرگت نەسووتێ: دوعاکردنێکی ئافرەتانە لەگەڵ یەکتری بە چاکە.
- جەمەدانی: جامانە.
- جوققە شینکە: جۆرە باڵندەیەکی بچووکە لە بولبول دەچێت لە کەناری ڕووبارەکان دەژی.
- جعێر، جاعێر: لاو، گەنج، جاحێڵ.
- جیقنە سپیلکە: نەخۆشییەکی پەلەوەرە.

- جرت و فرت: هاتن و چوون.
- جەلحە: جوتیار لەکاتی جووت کردندا بۆ ئاو خواردنەوە بەکاری دێنن.
- جانگە: بەمرۆڤی ترسنۆك دەگوترێ.
- جەبەلییە: بە کەسێك دەگوترێ گرنگی بە کارەکانی خۆی نەدات.
- جەحەندەم: جەهەننەم، دۆزەخ.
- جاجم: بەڕە.
- جیفلقاوە: بەیەکداهاتنەوە.
- جەوار: لە فەردە گەورەترە لە موو دروست دەکرێ.
- جاغ: لە گونیە بچوکترە، شەکرو چاو بڕوش و دانەوێڵەی تیا دەکرێ.
- جوجکە: جووجەڵە.
- جێژنەو جێژنە: لەم جەژنە بۆ جەژنێکی تر.
- جزرە: منداڵی ساوا لە بری (گۆشت) بەکاری دەهێنێ.
- جووڕە: جۆرە باڵندەیەکی بچوکە لە بولبول دەچێ لەکەناری ڕووبارەکان دەژی.
- جۆتە نەهات: دوو ساڵ لەسەریەك (لە دوای یەك) نەهات بێ.
- جۆتکە: جووتەیی ئەسپ و کەر، (لووشکە).
- جستان: زستان.
- جەعدە: جادە.
- جزدان: جانتای بچووك.
- جمات: جەماعەت، نوێژکردن بە جەماعەت.
- جۆرك: گونیەی بچووکە.
- جزوە: قاوەی تیا لێ دەنرێت.
- جمبوری: جمهوری، کۆماری.

- جەم بردی بووە: بە یەکێك دەگوترێ ماوەیەکی باش جەمەنانێکی باشی نەخواردبێ.
- جاندار: گیانەوەر، درندە.
- جبە: ئەو عەبایەی مەلاکان لەبەری دەکەن.
- جۆم: کەندی نزم.
- جۆبرکە: مەقەسە، جۆرە زیندەوەرێکە لە ژێر زەوی و باخچەی ماڵەکان دەژی.
- چەنگرەباز: کەسێك بە چنگ (لەپ) پەلاماری کەسێکی تر بدات، پردان، تاودان.
- چەنگ: لەپ.
- چەتیان، چەتان: پەردەیەکە بەسەر گالیسکەدا دەدرێ لە کاتی خەرمان گواستنەوە.
- جۆم: گۆمی ئاو.
- جلەکی تەرکە بە خۆت دادە: تۆقسە مەکە، قسە بۆتۆ نەهاتووە.
- جنوکە ، جندوکە: جنۆکە.
- جوولەکە: بە کەسێکی ترسنۆك دەگوترێ.
- جفت، جەفت: قیر.
- جاری گۆرینێ:جاری پێشوو.
- جلیتانی: هاتن و چوونی ((مشکە)).
- جۆگەلە: جۆگا.
- جورجیەت: جۆرە قوماشێکە.
- جنجرۆك: نینۆك وەشاندن، رنە لێدان.
- جۆت:جووت.

- چەرمەغە: کاری نارێك و خراپ.
- جرو جامشت: شتی بێ کەلك.
- چیغ و چەران: چیغ و سنگ.
- چەپان چەپان: چەپڵە، بە منداڵی ساوا دەڵێی چەپڵە لێدە.
- چاوساغ: سەرقافلە، سەرکردە، پیاوماقوڵ.
- چ بە هیمەت چ بە قیمەت: چ بە پیاوەتی بێ یا چ بە موڵك و سامان.
- چك چکە: دەنگی دڵۆپی ئاوە.
- جێی کارێ: شوێنێکی هەستیارە کەوتۆتە پشت گوێچکەی مرۆڤ.
- جەمرە: ناوی ئافرەتە.
- چەتار: چەتاڵ، لە زەوی دەچەقێنرێ بۆ ئەوەی تفەنگی لەسەر دابنرێ تا نیشانەی ڕاست بێ.
- چروك: هەر ئامێرێکی جەنگی وەك تفەنگ و دەمانچە و ... کاتی داگرتنی پەلاپیتکەی ئامێرەکە نەتەقێ دەگوترێ چروکی کرد.
- چما، چما نەکینێ: ئایا؟
- چاوحیز: کەسێك شتێکی خراپی کردبێ دواجار لێی ئاشکرابێ.
- چاو لێکەرییە: لاسایی و چاو لەیەکتر کردن.
- چاومۆن: جوێنێکە.
- چاوشلکانێ: یاریی، (چاوشارکێ).
- چێشتان، چێشتەنگاو: ئەوکاتەیە دەکەوێتە نێوان بەیانی و نیوەڕۆ.
- چەمووش: بەو (جاشکە) بێچوی کەرە دەگوترێ کە هێشتا پشتی نەکراوەتەوەو نابی کەس سواری پشتی بێ.
- چەپەرۆك: دەست وەشاندن.

- چەکمەجە: چاوەیەکی بچوکی (سندوق) یان کانتۆر یان کاوەنتەر) وشتی جۆراو جۆری تیا دەکریٚ.
- چش: هیچ.
- چاحەقت هەیە؟: حەقت نەبیٚ، پەیوەندی بە تۆوە نییە.
- چیٚرە بە کەرە: کاتی جووت بوونی گاو چیٚلە.
- چاو ڕووی دەویٚ: ئەو جۆرە قسەیە یان کارەیە نەتوانی بەرامبەر کەسیٚکی دیکە بیکەی یان ئەنجامی بدەی لەبەر شەرم کردن بیٚت، لە ڕووت نەبیٚ بیدرکیٚنی یان بیکەی.
- چ خوا هەردەگری؟: خوا هەڵناگریٚ.
- چەورۆکە: جۆرە گیایەکە لە پەلکی توور دەچیٚ و دەخوریٚ.
- چڕو چاو: جویٚنیٚکە.
- چم بە خراپی خۆشك نایێ: گومانم نییە کە خراپەم هەبیٚ یان کردبیٚ.
- چەلبە: جویٚنیٚکە، سەگە.
- چەلەنگ: دڕ، ئازا، هار، چاك، باش، ڕیٚك.
- چودباریەك: بەیەکەوە هات، هاتەوە ناویەك.
- چارۆگ: جۆرە سەرپۆشیٚکی ئافرەتانە.
- چارچمکی: دانیشتنی چوار لایی.
- چسوانم: چوزانم، هیچ نازانم.
- چمان نەدیت بیگیٚڕیٚنەوە: کەسیٚك بەخۆی هیچ یادگارییەکی خۆشی لە ژیاندا نەدیبیٚ بیگیٚڕیٚتەوەدو باسی بکا.
- چەچە بقڤە: بەکەسیٚك دەگوتریٚ کە کەس نەویٚریٚ دەستی لیٚ بدا و نزیکی بیٚتەوە.
- چەپك چەپکە: بەکەسیٚك دەگوتریٚ هەرجارەوجۆرە قسەیەك بکا.

- چاو چنۆك: ڕەزیل، هیچ نەدیتە.
- چەڕە دووکەر: دوکەڵی زۆر.
- چەننەی چوو: هیلاك بوو، بێزار بوو، شێت بوو.
- چەقە لـوولانێ، چەقەویرە: ئـەو کاتەیەکـە کۆمەڵـە سـەگێك بەیەکـەوە دەحەپن.
- چاوی پێ هەر نایێ: یەکێك شتێکی باشی دەست کەوتبێ، بەرامبەرەکەی پێی ناخۆشە ئەوشتەی دەست کەوتووە.
- چ لە گۆڕێ نییە: هیچ شتێك ڕووی نەداوە، قەیناکا، هیچ کێشە نییە.
- چەقێن: بەو زەوییە دەگوترێ کە بەردی زۆر بێ.
- چیغ: ئەو قامیشەیە کە لە چوار دەوری ڕەشماڵ چەقێنراوە، هەروەك دیوار وایە.
- چەرمە چەقاڵتە: جۆرە باڵندەیەکە.
- چەچ و پل: دەست و پەنجە.
- چـرا ڕەشکە: لـە قووتـوو دروسـت دەکرێ قەپاغەکەی سـەری، لۆکـەو داوە دەزی تیا هەڵدەکێشرێ و نەوتی تیا دەکرێ ڕووناکی لێ دروست دەکرێ.
- چاراوك: قاپێکە ئاوی تیا دەکرێ پەلەوەر ئاوی تیا دەخواتەوە.
- چنگی لێدا: پڕبەناو دەستی لەپی لێدا.
- چرم: چڵم.
- چەنەگە: گەردن.
- چورچە مەعاون: بە مرۆڤی لاواز دەگوترێ.
- چڕك: جۆرە دەرمانێکی کوردەوارییە لـە هـەویر دروسـت دەکـرێ دەخرێتـە برینی ئاوساو، بۆ خاوێن کردنەوەی برینەکە بەکاردێ.
- چادر: ڕەشماڵ.

- چەتلوم بووە: لەپێ کەوتووە.
- چاوی بەرایی نادا: ناتوانێ سەیری بکا.
- چوشتیر: بەرلەوەی ببێت بە (بزن).
- چقەیدێ یە: قەیناکا.
- چاوی بویتەوە: بەکەسێك دەگوترێ تازە شارەزایی و زانیاریی پەیدا کردبێ.
- چەند چینە: چەند جارە.
- چاوچاوانێ: عیشق بازی.
- چاوی گەلەك قمیمە: تەنها بەقسەی خۆی دەکا.
- چارەوێن: بنەجەرڕەیەکە سەگ ئاوی تیا دەخواتەوە.
- چەرمە سە: جوێنێکە:
- چینەکی خۆشی لێدە: باشی تێ هەڵدە.
- چشتیان کردتە هەش: کەل وپەلیان گران کردووە.
- چەرخوس: جۆرە خواردنێکە خەڵك لە زەمانی گرانی دەیانخوارد، ئەمەش بەرلە ووشك بوونەوەی فەریکە جۆ دەیانهاڕی.
- چەولگ: ئەو شوێنەیەکە (زیخ) ی زۆری هەبێ.
- چینە: بەو پەلەوەرە دەگوترێ لە (دان) دەگەڕێت و زبڵ پەرش و بلباو دەکات.
- چەتارە: لقەکانی (کارێزە) کە ئاو بۆ ((تونێلی کارێز)) دەهێنێ.
- چرك: هەرگر: بەو جۆرە قوماشە دەگوتری کە پیسی زۆر پێوە دیار نەبێ کە هەرچەندە ماوەیەکیش لەبەرکرابێ، چڵك هەڵبگرێ.
- حەمدانی : بە (مەڕی گوێ شۆڕ) دەگوترێ.
- حاری حاری سەیە: بەکەسێکی هەژارو نەدار دەگوترێ کە هیچی نەبێ.
- حەوێز: ناوی پیاوانە.

- حاوی: دارستان.
- حارو مەسەلە ئەوها بوو: باسەکە ئاوا بوو.
- حاشاحازری، حاشاگی حەموان: حاشابێ لە هەموو.
- حەزحەزۆکێ: خۆشەویستی کردن.
- حاها: چییە! چی بووا؟ چۆن وایە!؟.
- حەشری پێ کرد: بەکەسێك دەگوترێ خواردنێکی زۆر بخوات.
- حاجیلە: جۆرە گولێکی بەهارییە.
- حاروحەوارت: حاڵ و ئەحواڵت.
- حوسە: کورت کراوەی ناوی (حوسێن)ە.
- حەسۆ: کورت کراوەی ناوی (حەسەن)ە.
- حەوجە: پەشیمانی .
- حونەرە: هونەرە، گرنگە، ئازاییە، لێزانییە.
- حەییاتی لێ برا: مرد.
- حەزی لە گۆنگەرانە: حەزی لە شەڕە.
- حەفتییانە: پاش هەفتەیەك لە ژن هێنان کەس و کارو خزم و دۆست و هاوڕێیانی بووك و زاوا لە ماڵی زاوا کۆ دەبنەوە بەمەبەستی دیاری بەخشین پێیان.
- حەوارەی خوای کە: بۆخوای لێ گەڕێ.
- حەرام زادە: جوێنێکە.
- حەمایل: لە ملوانکە دەچێت ئافرەت لە ملی دەکات.
- حەژمەت: قین، داخ.
- حیلم قۆتێ: بازبازانێ.

# ﴿خ﴾

- خۆی لەسەر قوون ڕاناگری: بە کەسێك دەگوترێ زۆر هیلاك و ماندووبێ، هەردەم پاڵ کەوێت.
- خەفەت خان: گیرخواردن.
- خۆی لەمیش دایە: بەو ئافرەتە دەگوترێ ڕازاندرابێتەوە.
- خلچا، خلیچا: دوو کەس یان زیاتر لە یاری کردندا هەڵە بکەن ئەوە دۆڕاوە.
- خوا هەرناگری: خوا قەبوڵ ناکات.
- خۆگرخاندن: خۆ غافڵ کردن.
- خۆ بوخرێنە: ((پارە دەربێنە)).
- خەپەچاوەیتی: بە مرۆڤی (تەمبەڵ) دەگوترێ.
- خۆی مات کردییە: خۆی حەشارداوە (شاردۆتەوە).
- خۆی بەفەتارەت دا: خۆی تووشی ئازارێکی زۆرکرد.
- خاوگە: بریتییە لە دارێکی پان کە چەند ئاسنێکی باریك و تیژی پێوە بەندە، خوری پێ لێ دەدرێت وخاو دەگرێتەوە.
- خوا بە جوانکەیی خۆت ببەخشی: دوعاییێکە، خوا چاکت بکاتەوە.
- خوبزل هەوا: سەرەتای ساڵێکی وەرزی زستانە، کاتێ باران زۆر دەبارێ و پاشان ماوەیەکی باش ووشك دادێ.
- خۆی بە فەیزگەیاند: ئازاری بە خۆی گەیاند.
- خۆی هەر کوتایێ: بەکەسێك دەگوترێ خۆی بخزێنێتە ناو هەموو جۆرە بابە تێکەوە.
- خوایە دەست بە باری (عەمری)یە وەبگری: دوعاییێکە، خوایە ئاگاداری بی.

- خێری لێ ببینی: بە کەسێك دەگوترێ شتێ بکڕێ و لە داهاتوو خێری لێ ببینێ.
- خێر دەداتەوە: هەمان واتای پێشوو.
- خواسپیان هەرماری: خواسپیان کەشف بکات.
- خاسێ: ناوی ئافرەتانە.
- خرت: بە ((بەران))ی تەواو دەگوترێ.
- خوازێ: ناوی ئافرەتانە.
- خاویلە: بە مرۆڤی لەسەرخۆ (( هێواش)) لە کارەکاندا دەگوترێ.
- خۆلە گەژاوەی دەرنەهاتییە؟:
- خۆ ئەمە ناسکێ مەلولانێ نینە؟:
- خۆچ پەلە قەسەرمان لەپێ ڕانەچووە؟

بەکەسێکی لەش سادەو ناسك دەگوترێ. بەرگەی هیچ شتێ نەگرێ

- خەنانە: کاتێ کچ بە شوو دەدرێ لە بری نوقل و شیرینی، ئەمە بەسەر منداڵان دا دەبارێنن.
- خوام لەو خوایەی وەدەکەی؟: ترس دانە کەسی بەرامبەرە تا وەکو کاری خراپ ئەنجام نەدات.
- خێرو، خۆڕی: خوێڕی، جوێنێکە.
- خڵت و خار: پاشماوەی ژێرەوەی قاوەیە.
- خەرماشە: ئامێرێکی زەوی کێڵانە.
- خەوی لێ هەڕکایە (بزرکایە)): بە کەسێ دەگوترێ خەوی لێ نەکەوێ .
- خەجێ: ناوی ئافرەتانە.
- خەجیج: ناوی ئافرەتانە، لە (خدیجە) وە هاتووە.
- خەزێم: ئافرەت بۆ جوانی بەکاری دێنێ، بەلایەکی لووتەوە قایم دەکرێ.
- خوشکۆرێ: خوشکێ.

- خەزار: ناوی ئافرەتانە، لە (غزالە) وەهاتووە.
- خێران داربی: وەڵام دانەوەی ((بەخێرهاتی)) یە، مانای ((خۆش بی)) یە.
- خەبەریتی: ڕاست دەکات، قسەکەی دروستە.
- خرخار: خرخاڵ.
- خوایە بێ ئافاتی کەی: دوعاییێکە، لەکاتی باران بارینێکی زۆر دەگوترێ.
- خەفۆك: بە کەسێك دەگوترێ زوو خەوی بێ.
- خوا بە دەوت دا بڕۆنی: أنشاالله قسەی تۆ دەبێ ((دەردەچێت)).
- خۆکرکە: بێ دەنگ بە.
- خین دەبزوی: ناسینەوەی خزم و کەس و کار بەهۆی ((خوێن)) لە نێوان یەکتری.
- خمخانەی شین: شوێنی برینێکی سەر پێستی مرۆڤ خوێنی تیا کۆبوبێتەوەو مۆر هەڵگەڕابێت.
- خۆی لێمان هاویشتە سەر پشتێ: کەسێك شتێك بزانێ و نەیەوێ کەسێکی تر بەوشتە بزانێ.
- خەوە کوتکە: لەکاتی دانیشتن یەکێك خەوی بێ و جارجارە سەری بلەقێ و بە ئاگابێ.
- خشپە خشپ: هاتنی دەنگی پێی مرۆڤە.
- خدە: کورت کراوەی ناوی (خدرە).
- خش خشۆکە: یاریەکی منداڵانە.
- خەوی ڕەوییەوە: زڕ خەو بوو، کەسێك خەوی بێت پاشان ماوەیەکی کەمی پێ بچێت خەوی بڕەوێتەوە.
- خۆی هینایتە مەلایێ: بە کەسێك دەگوترێ خۆی بە زۆر نەخۆش بکەوێنێ.
- خۆی پشتەو شکێن کردیتەوە: کەسێك خۆی بچەمێنێتەوە. بەلای دواوە.

- خـۆی فـش کـردەوە: بـەو کەسـە دەگـوترێ خـۆی پـێ ئـازا بـێ و هـیچ دەسەلاّتیشی نەبێ.
- خیوەت: ڕەشماڵ .
- خلیسك: خزین:
- خلیسکە: ئەو ووردە پیازەیەکە دەچینرێ.
- خەسار بوو: بێ کەڵك بوو.
- خوارو خێچ: ناڕێك.
- خێل و خوار: بە مرۆڤی چاو ((خێل)) دەگوترێ.
- خوا عەویزەی دەداتەوە: دوعاکردنی کەسانێکە بۆ ئەو زەرەرو زیانانـەی بـە کەس و ماڵ و سامانیان کەوتووە.
- خەونی جڕنا و فڕنا: خەونی بێسەرو بەر ((بێ مانا)).
- خۆی هەر کوتایێ: چووە ناو مەسەلەکە ((بابەتەکە)).
- خۆرە سۆر: خۆڵی سوور، ئەم جۆرە خۆڵە بەکاردەهێنرێ بـۆ نـەمانی شـتی گلاّوە بووی سەر لەشی مرۆڤ، ئەویش بە شوشتنی شوێنی گلاّوە بووەکە.
- خۆرو خۆرەسات: بە گەلێك شتی زۆر یان خەڵکانێکی زۆر دەگوترێ.
- خواتێکی نەدا: ئەو ماڵە هەر ئاوەدان بێ.
- خەنی بوو: پێی خۆش بوو .
- خوانەخواستە: نەخوازەلاّ، خوانەکردە.
- ختتە: بە ((پشیلە)) دەگوترێ لە (قطـە) وە هاتووە.
- خوریکە: سورێژە، سۆریکە.
- خەمەگڕوو: زینـدەوەری (شـەوگەرد) لـە مارمێلکە دەچـێت بـەلاّم قـەبارەی گەورەترە.
- خۆش داگەنە: میوەی (لالەنگی) یە.

- خیتی کرد: بردی، دزی.
- خۆی تەنها کردییە: بەکەسێك دەگوترێ جل و بەرگ کەم لەبەر بکات.
- خۆی شێلو کرد: خۆی شێواند.
- خرنوك: گیایەکی درکاوییە بەرەکەی دوای ووشك بوونەوەی بۆ چارەسەرکردنی کول بوونی دەم و نەخۆشی گەدە بەکاردێ. تامی بەرەکەشی (تفتە).
- خینی تێزایە: شوێنی برینێك کاتێ خوێنی تێدا کۆ ببێتەوە.
- خیندەوار: بە مرۆڤی (خوێندەوار) دەگوترێ.
- خەرتەلە: جۆرە گیایەکە لە شوێنی ڕەق شین دەبێت.
- خوانەکەرانێ: نەخوازەلا، خوانەکردە.
- خۆی شەریف کردییە: خۆی کردۆتە پیاوێکی باش.
- خۆرە چەرمت لێ کەوێ: جوێنێکە.
- خیز: تەڕایی.
- خنس بەچە: قرچۆك- ڕەزیل.
- خوچە: کورتکراوەی (خوشکەیە).
- خاکاو: بەر لە چاندنی تۆ و شەتل، خاکەکە ڕێك دەخرێ و پاشان ئاو دەدرێ دواجار خاکەکە کزر دەبێتەوە ئینجا تۆوەکە دەچێنرێت.
- خاروك: بەو پێلاوە دەگوترێ کە جاران لە گیا دەچنرا.
- خنخنۆك: قورگ.
- خەرمان لۆغە: جاران مندالی (لادێ) بە تاك و کۆمەڵ دەهاتنە سەرجۆخینان لەسەر ڕەوسەکان دەگەڕان، (خەرمان لۆغە) یان خڕ دەکردەوە دەیانگوتە خاوەنی ڕەوسەکان: (خەرمان بەرەکەت) ئەوانیش دەیانگوت (خێرو بەرەکەت)، ئینجا خاوەنی ڕەوسەکە هەڵدەستا (کۆشی)

منداڵەکانی پڕ دەغڵ دەکرد، یاخود ئەگەر کلاّویان لابوایە ئەوا کلاّوەکانیان بـۆ پڕدەکـردن، پاشـان منـداڵی دەچـونە نـاو گونـدەوە ، تـرێ و هـەنجیرو هەناریان پێ دەکڕی و دەیانخوارد.

- خێی عارەبان ڕژا: بەو منداڵانـە دەگوترێ بۆ دڵدانەوەیان کـاتێ بەردەبنـەوە سەر زەوی.

## ﴿د، ڕ﴾

- داوەراوە: خۆی نەوی كرد، داهاتەوە بەرەو خوار.
- دەڕی: بە كەسێك دەگوترێ پیسایی بكات.
- درە گوتە: (لێدانی دڵ)ە.
- دران: ددان.
- دندوك: دەنوك.
- دری لە خۆ بۆوە: لە هۆش خۆی چوو.
- دەغەزاری بوو: لێی بێزار بوو.
- دكر دەكا: بە مرۆڤی هارو هاج دەگوترێ.
- دەفیڕكێنی: بە كەسێك دەگوترێ لە كاتی سك چوون خۆی پێ ڕاناگیرێ.
- دەستی لێستاندیتەوە: بە كەسێكی نەخۆش دەگوترێ كاتێ بە تەواوی لە دەست و پێ كەوتبێ.
- دەشلێنی: دەلەنگێنێ.
- دواتان بڕڕێ: دوعایێكە، كەستان لێ نەمینێ.
- دەرێی تەریفە بووە: بە یەكێك دەگوترێ زۆری تێنووبێ.
- دەك ڕاست نەبیەوە: دوعاكردنە بە خراپە.
- دەرب و دۆب: جل و بەرگی فراوان و بەرین.
- دارو بەرد لە دەستی بە دادە: بە مرۆڤی هاروهاج دەگوترێ.
- دەرەك: شوێنێكی كون بوو.
- دوڕ: ١- ناوەند ٢- شتی بە قیمەت.
- داغان: وێران.

- دەرێی گای لە زگی گوژرایتەوە: بەکەسێك دەگوترێ کە هیچ هەست بە برسیەتی نەکات.
- دائیرەی مەعاریف: دائیرەی تاپۆ.
- دوو گورد: بەرماڵی نوێژکردن.
- دۆینە: جۆرە چێشتێکە لە دۆو گەنمەکوتاو (پونگ یان کاردی) دروست دەکرێ.
- دەرخونە: سەرە مەنجەڵی لە دار دروست کراو (سەرقاپ) ....
- دژوون: پیس بوونی لاشەی مرۆڤ.
- دەرب: قەڵەو، بەرین.
- دەوجە وەرە!؟: ووشەیەکی سەر سوڕمانە، (دەتۆ بزانەها!؟).
- داخ سۆر: بە (گونیە یان فەردە) ی گەنم و جۆ دەگوترێ .
- دۆغەوا: جۆرە چێشتێکە لە (کفتە) دەچێت، قیمەکەی لە هێلکەو پیاز پێك دێ، مەرەگەکەشی لە ماستاو و تەڕە پیاز دروست دەکرێ.
- دامە: جۆرە یاریەکە، بە زۆری پیاوی بە ساڵاچوو لە ژێر دیواری مزگەوت و باخچەو و ماڵەکان ئەنجامی دەدەن.
- دەم دەمی: بەو کەسە دەگوترێ هەندێ کات لەگەڵ خەڵکی باشەو هەندێ کاتی تریش خراپە.
- دەستڕ: دەسەسڕ، خاوێن کەرەوە، لە (duster) ەوە هاتوە.
- دەستاڕ: ئامێرێکە لە بەرد دروست کراوە، ساوەری پێ وورد دەکرێ.
- دەست شۆر: لە فافۆن دروست کراوە، لە شەپقەیەکی گەورە دەچێت، خەڵك دوای نان خواردن دەستیان لەسەر دەشۆن.
- دار دوو لق: دار لاستیکی منداڵان، بەردی پێ دەهاوێژرێ.
- دار جغارە: دارجگەرە.

- دبە: لە پلاستیك دروست دەکریٚ، ئاو و ڕون و بەنزین و نەوتی تیادەکریٚ.
- دەتریوینی: هەست کردنە بە لیٚدانی شویٚنی برینیٚك دوای زامداربوونی .
- دیٚمکە: لە ماددەیەکی پلاستیك دروست کراوە، کاتیٚ شویٚنیٚکی مرۆڤ بە ژان دیٚ ئەم ماددەیەی پڕ ئاوی گەرم لەسەر دادەنریٚت بۆ ئەوەی ئیٚش و ژانەکەی نەمیٚنیٚت.
- دوو قەد: دوو پارچە، نووشتانەوە.
- دیٚزە: بەو گویٚ دریٚژە دەگوتریٚ کە جووتە دەهاویٚ و کورتان فریٚ دەدا.
- داندۆك: لە ساوارو ماست دروست دەکریٚ.
- دەلینگ: دەرپیٚ ی ئافرەتانە لە دووبەرە قوماش پیٚك دیٚ.
- دەست خەرمت: فیٚڵ کردن، بە هەڵەو فیٚڵ ڕیٚ بەکەسیٚکی تر نیشان بدەی.
- دەریٚی فیشەکە شیٚتەیە بە عاسمانیٚ دەکەویٚ: بەو کەسە دەگوتریٚ لە ماڵیٚك بیٚ و لە هەموو شتیٚ بگەڕیٚ.
- دەستی دەریٚی ئاسنە: دەستی زۆر ساردە.
- دەوتیٚ دەکوتی: ۱- شتیٚکی لیٚ دەزانیٚ ۲- تەداخول دەکا.
- دەکرێتەوە: بەرلە تووش بوون بە ڤایرۆسی هەڵامەت گەروو (قورگ) هەست بە خوران بکات.
- دایەوە کەندیٚ: سەرنەکەوت.
- دەریٚی ماڵۆسەپان بوویتەوە: جویٚنیٚکە.
- دەریٚی کووا!؟: چی دەڵیٚی؟!.
- دەڤاچیٚنتەوە: بە کەسیٚك دەگوتریٚ لە زۆرشت کەم بکاتەوە. فیٚڵی لەگەڵدا بکات.
- دای تەکیٚنە: خاویٚن کردنەوەی ڕایەخی ناو ماڵ و لیٚف و بەتانییە لە تۆز و خۆڵ.

- دەق هەوە: خۆیەتی.
- دمۆر: بێ بەخت.
- دارِو جان: جۆرە گیایەکە لە ناو شینایی دەڕوێت، خۆراکی ئاژەڵیشە.
- دار گەز: جۆرە گیایەکە، گەسکی لێ دروست دەکرێ، دەرمانی لێ دەردەهێنرێ، چەوری یەکەی بۆ چارەسەرکردنی ماکی دەم و چاو بەکاردەهێنرێ.
- دادەوە: داپۆشە.
- دەرەقەتی هات: زاڵ بوو بەسەری.
- دەرێ لەمن مەگەڕێ: کاتێ مرۆڤ شتێکی لێ وون دەبێ و نایدۆزێتەوە.
- درۆزن فەرقی پێ دەکا: قسەیەك، کردەوەیەك کەمێك ڕاست بێ.
- دەسرازە: لەبەن یا لە پەڕۆ دروست دەکرێ، لەناو (لانك) دەست و پێی منداڵی پێ دەبەسترێتەوە.
- دای چەقاندییە: کاتێ مرۆڤ دەستی بە ئاو دەگەیەنێ.
- داگەسێ، داکاسێ: دانیشە، وازبێنە، مەکە.
- دەسك: قوڵپ.
- دوو زمان: دوو ڕوویی.
- دەپڕوشێنی: دەسپێکی باران بارینە بە ووردی.
- دەرێی جیوەی تێدایە: بە مرۆڤی زۆر بە جووڵە دەگوترێ.
- دەمامك: قوماشێکە هەموو ئەندامەکانی سەر دادەپۆشێت جگە لە ((چاو)).
- دەمەکانیتکە، دەمێ دی،: تۆزێ ((کەمێ)) لەمەوبەر.
- دەبی وەبی؟: دەبێ وابێ؟.
- دۆڵسە: فراوان، بەرین.
- دەغەر: بێزار.

- دری تەقی کرد: دڵی شەقی برد.
- دەرو جیران: دراوسێ
- دەرگەوارایە: دەرگا والآیە ((کراوەیە)).
- دەندە: ئێسکەکانی پەراسووە.
- دلیوان: دەرزییەکی گەورەی درومانە.
- دەست بار: هەلگرتنی شتێکی گرانە بە دوو کەس.
- درەکزە: سووتانەوەی گەدەیە لە ترشەلۆکی.
- دری دەخێورێتەوە: گەدەی هەڵدەچێ.
- دەرەز: درز، کەلێن.
- دش: خوشکی مێرد.
- دەوی داپچرپییە: دەمی کردۆتەوە.
- دوکە دوکی ژنان: گریانی ئافرەتان.
- دنیاوبنیای هینایتە گۆڕێ: کاتێ یەکێك کەل وپەلی ناوماڵ پەرش و بلاّو دەکاتەوە.
- دەرزیلە:ئامێرێکی دورمانە.
- داگە سۆرە: لە خۆشەویستی یان بە کچی بچوك و پارچەڵە دەگوترێ.
- دەست خەرۆ: پەشیمان بوونەوە، جێ بەجێ نەکردنی وادەوبەڵێن.
- دەسکە چنە: جۆرێکە لە گیای تۆڵەگە، گەلاّکەی پان و لاسکەکەی ئەستوورە.
- دەرۆزە: سواڵ.
- دووزەللە: ئامێرێکی مۆسیقییە، ((جوزەللە)).
- دەلحازرەکی: یەکسەر.
- دمبگ: تەپڵ.

- دەبدەبە: میزەڵان.
- دەك دافەتێی: ⎫
- دەك داوەششێی: ⎬ سەرکۆنەکردنە.
- دەك دارزززێی: ⎭
- دێوەرە: گەڕیدە بە کەرو بارییەوە.
- داتەپییە: ڕوخاوە، کەوتووە، بۆ خانوو بەکاردێ.
- دەلاقـە: کـونێکی بـچوکە لـەناو ژووری خـانوودا، قەبارەکـەی لـە ((نیـو تـا بلۆکێك دەبێ)).
- دەستی لێ شوشتیتەوە: شتێ بزر بکەیی و نەیدۆزییەوە.
- دۆخین: لە بەن و موو دروست دەکرێ، دەخرێتە نێە نیفۆی شەرواڵەوە.
- داخیلە، دەخیلە: پارەی تیالەناو پاشەکەوت دەکرێ.
- دۆغەوا: جۆرە خواردنێکە لە ماست و برۆش و هێلکە و تەرەپیاز پێك دێ.
- دنیا دیتە: گەڕیدە، بـە کەسێك دەڵێن زۆر شـوێنی دیـبێ و شارەزاییـشی لـە زۆربەی بوارەکاندا هەبێ.
- درۆیـەکت لێـی چـاوە؟!: چـۆن بـاوەڕی پـێ دەکـەی؟ بەکەسـێکی درۆزن دەگوترێ.
- دیدە: ئامێری ئاگادارکردنەوەی ئۆتۆمبیلە.
- دەرێی سوسکەیە دەڕوا: بەکەسێکی دەگوترێ خێرا بڕوا بەڕێوە.
- دایان: بەخێوکەری منداڵ.
- دایکردە بارانێ: باران باری.
- دابەستی: بەخێوکردنی ئاژەڵی بچوکە تا گەورە دەبێ.
- دەرێـی گـورگی کوشـتییە: بەیـەکێك دەگـوترێ زۆری برسـی بـێ و بـە پەلـە خواردن بخوات.

- دایبەستا: دەستی پێ کرد، سەرەتای دەست پێ کردن.
- دایدڕی: کەمی کردەوە، دڕاندی.
- دایپەرۆست: لێی کەم کردەوە.
- دەنگی لێوە هینا: بێزاری کرد.
- دۆمبەران: خواردنێکە، ((دۆمەلان)).
- دەرێی لە گرانی هەستایەتەوە: بە کەسێکی زۆرخۆر دەگوترێ.
- ڕەبەق: تەواو.
- ڕەخت: خەریتەی فیشەکە.
- ڕاتـەورە: کۆمەڵـە وولاغێـک بـە گوریـسێکەوە دەبەسـترێنەوە تـاوەکو شوێنەکەیان دیاری کراو بێت.
- ڕاموسان: ڕابواردنی دوو دڵدارە، لەکاتی بەیەك گەیشتنیان.
- دڕ ئاگای لە دریيە: دڵ ئاگای لە دڵە، خۆشەویستی نێوان دوو هاوڕێ.
- دۆرمە: دۆڵمە، یاپراخ.
- دەست هندو: کەل و پەلی پێویستی جووت و جەنجەڕە.
- دەفە: ڕۆڵی ئامێری جەنجەڕ ((بالتەی)) پێوە بەستراوە ((کوتراوە)).
- داس: ئامێرێکـە گـەنم و جـۆی پـێ دەدورێتـەوە، ئاسـنێکی کەوانەییـەو دەسکەکەشی لە دار دروست کراوە.
- داغ دار: داخ لە دڵ.
- دێمی دایە: کولانی لەسەرخۆ، ئاگرێکی نزم لە ژێرەوەی خواردن ((چێشت)) یان ((چای))ەوەبێ.
- دامایە: داڵغەی لێداوە، بیر دەکاتەوە.
- دانگە: لە وەڕگا.
- داوەت: شایی، هەڵپەڕکێ.

- دەوا: سك ئاوسانە.
- دەهری: توورە.
- داخوا: دەبێ.
- دووکان: ئەو پارچە زەوییەی کە ڕووەکی تێدا شەتڵ دەکرێ.
- دروونە: بڕینەوەی جۆ و گەنمە پاش زەردان.
- دۆ: ماستی هەژاوەیە، کەرەی لێ وەردەگیرێ.
- دەستە مستە: ئەو شوێنەیەکە بۆ بیرلێدانی کارێز لە پەروانەی بیرەکەوە دەگیرێت.
- دەست هەرینان: بە گژداچوونەوە، بەرەنگاربوونەوە.
- دەرێی کەوزی شینە: ((ئاو)) لە ڕوونیانەوە (سەوز و شین) هەڵگەڕێت (کوز) لە قەوزەوە هاتووە.
- داری خلّتان: جۆرە دارێکەلە نێو (چەم) دا دەڕوێ.
- داکی کراس ڕەشان نەبڕایە: واتە (کچ) هەردەم زۆرن بۆ مارەکردن لەو گەنجە کوڕانەی کە دەیانەوێ هاوسەرگیری دروست بکەن و پێك بێنن.
- دراو: شینایی، کاتێك چەند گۆڵێك بەیەکەوە ئاو دەدرێ، دواجار ئەم خەتە بە (خۆڵ) دەگیرێ.
- دەوی بەمۆری خوایە: بە کەسێك دەگوترێ کە بۆخوا بە ڕۆژوبێ.
- دۆدان: کەل و پەلێکی کوردەوارییە، لە پێستی ئاژەڵ دروست کراوە، دارێکی لەمل خراوە، کونێکی تێکراوە و ئاسنێك یان دارێکی خراوەتە ناوی بۆ ئەوەی (دۆیە) کەی پێ تێکەن و لێی بە تاڵ بکەن، لە پەلەکانیشی داریان بەستاوە بۆ ئەوەی نەکەوێ، لەکاتی دانانی دا (دۆدان) هەڵگری (دۆ) بووە.
- ڕەش گور: جۆرە گەنمێکە بە دێمی دەڕوێت و دەچینرێت.
- ڕانگە: مووی ناو ((ڕانی بزنە)).

- ڕەوسە: دەغڵ.
- ڕەنـــدە: ڕۆخـــی دەرەوەی قرشـــەی خـــەرمانی نـــەکوتراو لـــە کـــاتی جەنجەڕکردندا.
- ڕێی داناگرێ: ناتوانێ بڕوا جا لەبەر هەر هۆیەك بێ.
- ڕاجفری: یەکێك لەکت و پڕێکدا لە خەو ڕاپەڕێ.
- ڕاکشایە: پاڵ کەوتووە.
- ڕەنگ و بۆی خۆشە: تەندروستیی باشە.
- ڕەقێتە: سەرمابوون.
- ڕەچەرۆك: بنەچە، ڕەچەڵەك.
- ڕەنگارە: جۆرە باڵندەیەکە، لە ڕیشۆڵە دەچێت.
- ڕنۆك: ڕنە، نینۆکی تیژ.
- ڕوعب: ڕوبع ((پارەی پێشوو)).
- ڕەدەل و بەدەل: ئاڵوگۆڕی.
- ڕەفیس: ڕەسیف، لە (رصیف)ەوە هاتووە.
- ڕانك: شەڕواڵ، لە مووی ئاژەڵ دروست دەکرێ.
- ڕازیانە: جۆرە خواردنێکی منداڵانە، قەبارەکەی زۆر بچوکە.
- ڕکێب: یەکسەر، زوو، پەلە.
- ڕەشکەو پێشکە: تارماییەکی ڕەشە جارجار بەبەرچاوی مرۆڤ دادێت.
- ڕەنگبی: لەوانەبێ، لە وانەیە.
- ڕهێرەکە نەبیتەوە: باران بارینێکی زۆرە- ڕەهێڵە-
- ڕوپیە: دراوە، درهەم و نیوێکی ((٧٥)) فلسی زەمانی کۆنە.
- ڕیس: لە ڕێسینی خوری دروست دەبێ.
- ڕەپ: ڕەق.

- ڕبە: ئامێرێکە گەنم و جۆی پێ دەپیورێ.
- ڕووتە: بەو کەسە دەگوترێ جل وبەرگی لەبەردا نەبێ.
- ڕەتی کە: ١- بیپەڕێنەوە ٢- لایدە، بیدە ئەوی تر.
- ڕوحی لەسەر سەری ئەو مندارانەیە: بەو کەسە دەگوترێ کە منداڵی خۆی و خزم و کەس و کاری زۆرخۆش بوێ و ئاگای لێیان بێ.
- ڕك: شوێنی سەرهەوراز، مرۆڤ بە زەحمەت بە سەر ئەو شوێنەدا بکەوێ.
- ڕکە: ((غەزرین))، مرۆڤ و ئاژەڵ دەگرێتەوە، کاتێ لەسەر کارێك مگوڕبن بەویستی خۆیان هەڵسوکەوت بکەن.
- ڕەشی کردییە: بەیەکێك دەگوترێ هەردەم ((براوە))بێ لە یاریدا.
- ڕوحی هەرقەنایە: زۆر ترساوە.
- ڕەوان: ١- ڕاست و دروست ٢- سك چوون ٣- جۆرێ لە ڕۆیشتنی وولاغ.
- ڕەوانی کە: بینێرە.
- ڕفۆك: بە شوێنی ڕۆچوی نەرم دەگوترێ.
- ڕۆخ: کەنار، لێوار، قەراغ.
- ڕەشە دەم بەش: مەقری، جۆرە قازانێکە خواردنی لە ناو سوور دەکرێتەوە.
- ڕەش بگیر: هەڵلا، قەڵەبالغی.
- ڕێزە میرانە: ڕاوەستانی خەڵکە بەڕێز.
- ڕەتی کەوە: بیگەڕێنەوە، ، بیدەوە خاوەنەکەی.
- ڕەمەکی: هەروا.
- ڕادوێن: ڕادیۆ.
- ڕیخ: پیسایی ئاژەڵە، گا ، چێڵ...
- ڕیخەرۆك: ڕیخۆڵە.
- ڕزی: بۆگەنی، دڕاو.

- ڕەشوێرە: ڕیشۆڵە.
- ڕاوە دونان: بە دوادا غاردان، ((ڕاکردن)).
- ڕۆرە: ڕۆڵە، جگەر گۆشە.
- ڕەوییەوە: گەڕایەوە، نەهات.
- ڕەشید: ئازا، چاو نەترس.
- ڕمب و هۆڕ: دەنگە دەنگی دەهۆڵ و تەپڵ...
- ڕەبەن: تەنهایی.
- ڕوارە: ١- بە پێچکەی بێشکە (لانك) دەگوترێ ٢- گوندێکە لە دەشتی قەراج.
- ڕێسە: لامل.
- ڕسەر: جۆرە مەڕێکە.
- ڕاژدی: شەپازللەی بەهێز.
- ڕەفیسك: دیوی ژوورەوەی نێوان( ڕان و بەلەك و دیوی دەرەوەی (چۆك- ئەژنۆ) یە
- ڕکەی تیژە، ڕکەی گرتییە: بە زۆری بەو منداڵە لاملە دەگوترێ کەڕقی هەڵدەستێ وڕاوەستانی بۆنییە، هارو هاجە.
- زەنەك: زۆلکاو، زۆنگاو.
- ڕەشکە: گیایەکی خۆماڵی کراوە، گەڵاکەی وورد و شینە گوڵێکی زەرد دەگرێت، نیو مەتر لە زەوی بەرز دەبێتەوە گوڵەکە ((تاپورێك)) دروست دەکات کە پاشان تۆوەکەی تیا کۆ دەبێتەوە، ئەمەش هەر لە تۆوی ((پیاز)) دەچێت، پاش ووشك بوونەوەی ئەو تاپورەی کە تۆوەکەی تیایە، تۆوەکە دەگرن و دەی کوتن و دەبێتە ڕەشکە، بۆ چارەسەرکردنی گەلێك نەخۆشی بەکاردێ.

﴿ز﴾

- زەندەقی چوو: } ترسا
- زراوی چوو: } ترسا
- زەردان: گەنم و جۆ زەردانە.
- زوخەر: گەڕۆك.
- زۆر سەهوی: خەیاڵت خاوە.
- زەنگور: زەنگوڵە: بەملی ((مەڕو بزن)) دەوە دەكرێ دەنگێكی موسیقی هەیە.
- زددل كەسر: دژی شكان، شتێك قابیلی شكان نەبێ، لە (ضدَ الكسر) دەوە هاتووە.
- زیلی: سەرەتیژەكانی ((دڕكە)).
- زولفان: ناوی ئافرەتانە.
- زمان دڕای: بەو كەسە دەگوترێ قسە بە خراپە بگێڕێتەوە.
- زرۆبی: جۆرە خواردنێكە لە هێلكە و ئارد و ڕۆن دروست دەكرێ.
- زیڕەی دەگاتە عەرشی عەزیم: بەو منداڵە ساوایە دەگوترێ بە كوڵ دەگری و هاوار دەكات.
- زێدە گۆشت: زیادە گۆشتی ووردی سەرپێستە.
- زۆر ڕەو: بە كەسێك دەگوترێ زۆر قسە بكات.
- شەقە زللە: شەپازللە.
- زەبەلاح: گەورە
- زرار: ناوی پیاوانە.
- زەنگیانە: بە مێرووی زۆر بچوك دەگوترێ.

- زەرگە زەوی: جۆرە خواردنێکە لە ژێر زەوی دەڕوێت.
- زیرە گوشتی: بە مندالّی (منجڕ) دەگوترێ.
- زیقاندی: قیژاندی.
- زوور: گرد، زوورگ.
- زارێ : ناوی ئافرەتانە.
- زەمۆك: ناوی ئافرەتانە.
- زڕ هەر زڕە: بەو کەسە دەگوترێ لە دایکێکی تر بێ.
- زولێ: کورت کراوەی ناوی (زولیخا)یە.
- زەنگە زۆرە: زەردەوالّە.
- زەرگەتە: لە (زەردەوالّە) بچوك ترە.
- زەرێخ: ناوی ئافرەتانە.
- زبێدە: ناوی ئافرەتانە.
- زووری: ناوی ئافرەتانە.
- زەریف: ١- خۆش ٢- ڕێك و پێك، لە (ضریف) ەوە هاتووە .
- زیزبووە: تۆراوە.
- زاری بەرێت خۆش بی: وەلاّم دانەوەیە بۆ ووشەی ((بەلّێ)).
- زیپکە: دەرچوونی (جوانکە)ی هەرزەکارییە لەسەر دەم و چاو.
- زیتکە: داوێکە لە ناوەڕاستی (فاق) تەڵەوەیە، سەرەکەی دەنکە گەنمێکی پێوە دەکرێ بۆڕاوەکردنی کۆترو چۆلەکەو.....
- زەلام هەر هەندە گۆتیان تێس تێس: لەلایەن ئافرەتانەوە دەگوترێ کاتێ لە میواندارییەکەوە هەڵدەستن و دەڕۆن.
- زبارە: لە هەر مالّێکدا یەك دوو کەس بۆ لایان دەچن و یاریدەیان دەدەن لە کاردا.

- زەندۆر: ((زەندوڵ)) ئەو چاڵەیە کە ئاوی باران لە زەویدا دروستی دەکا و ئاوێکی ڕوونی تێدایە.
- زەختەی تێ ڕاکە: دارێکی بچوك جارجارە لە سمتی گوێ درێژ ڕا دەکرێ بۆ ئەوەی بە خێرایی بڕوا.
- زەرتك: زەردویی.
- زریکەی لێدا: جوێنێکە، بە گوێ درێژ دەگوترێ.
- زەرەرمەند: زیان لێ کەوتوو.
- زێلاق: شوێنێکی بەقوڕو لیتەیە.
- زرچەی هات: دەنگی لێدانی ((شەپا زللە))یە.
- زووراوە: ژان و ئازارێکی کەم بەسەر پێستی مرۆڤ دابێت.
- زگورتی: تەنهایی، ڕەبەن، بە کەسێکی بێ ژن و ماڵ بێ.
- زڕداك : ((باوەژن))
- زڕتە زەلام: بە پیاوی قەڵەو ((حێل)) دەگوترێ.
- زبر: ١- زبڵ ٢- شتی درشت و دڕو ڕەق.
- زێقەتی : تەنگانە.
- زەفتی کرد: زەوتی کردن نەیداوە.
- زۆرو زەوەند: گەلێك زۆر.
- زووبە: زووکە، خێراکە، پەلەکە.
- زەفەری پێ برد: زاڵ بوو بە سەری، پێی وێرا.
- زگماك: لە ناو ڕەحمی دایك.
- زۆرانێ: زۆرانبازی.
- زرپە: بە پیاوی ((قەڵەو)) دەگوترێ.
- زڕخەو: خەولێ نەکەوتن، خەو نەهاتن.
- زیوێر: ئەو گۆشتەی کە زۆر بە چاکی و تەواویدەکوڵێت و هەلاهەلا دەبێت.
- زاخ: جۆرە ماددەیەکە وەکو (شەب) وایە لە کاری ڕەنگکاری بەکاردێت.

# ﴿س﴾

- سوو: (داخ، خەم، خەفەت.
- سەی لە سەی بە پاش کەتی: جوێنێکە.
- سەرشۆر: گەرماو.
- سوغرە: کارپێکردنی بە زۆر.
- سێبەندی: زۆرزان، زیرەك.
- سەرم لە گوی دەرینا: لەکاتی دەرهێنانی یەکەم ((دۆمبەلآن)) یان دۆزینەوەی (دۆمبەلآن) ەکەیە.
- سەدە: هێلێکی ڕاستە لە (کێلآن).
- سەرسەدە: کۆتایی هێلی جووتە بۆ گەڕانەوە.
- سواڵە: دەسکی دەغلی دوراوەی دەستی سەپانە.
- سێلك: کۆکردنەوەی ((ووردە کوتەکە)) بە بۆ شەنەبا کردن.
- سەرگراو: ((سەپان و وەرزێر)) بەکاری دەهێنن.
- سۆرگور: جۆرە گەنمێکە بە دێمی دەڕوێت و دەچێنرێت.
- سەرپەڕ: لاپەڕ، پەرگە.
- سەفرا: جۆرە نەخۆشییەکە بەهۆیەوە ئاوێکی زەرد لە دەمی نەخۆشەکە دێ.
- سەمسوونە: جۆرە توتنێکە.
- سپێر: سەنگەر.
- سەرسەندە: جۆرە گیاییەکە ، تایبەتمەندییەکەی لەوەدایەکە بە وەرزی هاوینان سەوز دەبێت و کە ڕووی ((دۆمبەلآن)) جاروبار لە ناوەوەی ئەو گیایە دەردەچێت.

- سوڕنات: جۆرە گیایەکی ژەهراوییە لەناو پەرێزەوە دەڕوێت.
- سوکەرە: بە کەسێکی تەمەن بچوك دەگوترێ کە ئیشی زۆری پێ بکەن.
- سەری کەچەری دەسوتێنی: کاتێ کەش و هەوا زۆر گەرم دادێت، و مرۆڤ بەرگەی ئەو گەرمییە نەگرێت.
- سرپە: نۆرە، نۆبە.
- ساکە گۆر: گۆڕەپان.
- ساف بڕ: بە بڕینەوەی (خوری ی هەموو لەشی مەڕ بە تەواوی) دەگوترێ.
- سیوەرۆك: جۆرە گیایەکە پەل داوێ و (دەنك) دەگرێ و دەشخورێ.
- سەرە مەڕ: لەدوای ئاژەڵی (بەردیل) دێت) دوای گەورەبوونی.
- سەی لە بابی سە: جوێنێکە.
- سوارە: ١- ناوی پیاوانە ٢- باوەشە دەغڵی دروێنە کراوە ((سواڵە)).
- سەری خۆم لۆ کیندەرێ هەگرم؟: بۆ کوێ بڕۆم؟.
- سەیەکی برسی تێری لێ دەخوا: بە کەسێك دەگوترێ هەموو لەش و گیانی پیس بێ.
- سەرەڕۆ: بە کەسێك دەگوترێ گوێی لە هیچ شتێك نەبێ و نەگەڕێتەوە.
- سیمرخ: باڵندەیەکی ئەفسانەیی نێو چیرۆکە کۆنەکانە.
- سێپێك: سێپایە، ((مەشکە)) پێوە دەبەستن بۆ هەژاندن.
- سراو: سەر ئاو، ئاو هێنان لە کانی و بیرو ڕووبار.
- سەوی: سەبەتە، قەر تالە.
- سندم کرایە: ئامێرێکی ئاسنی یە پێی گیراوەکانی لە گرتووخانە پێ دەبەسترێتەوە و ئاژەڵیشی پێ پەل بەست دەکرێ.
- سەوە شیر: بریتییە لەو سەبەتەی کە هاوینان بەسەر شیرو ماستدا دەدرێ.
- سکە زنجیر: ئەو ئاسنەیەکە وولاغی پێ دەبەسترێتەوە.

- سەرمژانکە: بریتییە لەو دوو دارەی کە دەکەوێتە ئەم لاو ئەولای وولاغەوە.
- سەومر: ناوی ئافرەتانە.
- سەردولکە: پیاهەڵدان و هەڵگوتنی تراژیدیاییە.
- سۆراغ: بە دواداچوون، بە دواداگەڕان.
- سمت: دواوەی مرۆڤ.
- سسش: شوانەکان لەکاتی لەوەڕدا ئەم ووشەیە بە جۆرە ئاوازێك ئاراستەی ((پەزو بزنەکانیان)) دەکەن و ئەم لاو ئەو لایان پێ دەکەن.
- سەرە ژن: بەو ئافرەتە دەگوترێ لەسەرووی مەجلیسی ئافرەتانەوە دادەنیشێ.
- سەرە قەرەمانە: کەسێك دوعایی بۆ کەسێکی تر بکا بە ((پارە)) بۆ ئەوەی چاك بێتەوە.
- سۆبە: ئامێری گەرم کەرەوەیە، سۆپا، (زۆپا).
- سۆرێ: ناوێ ئافرەتانە.
- سەرە سوڕە: سەر سوڕان، گێژ خواردن.
- سورمێ: ناوی ئافرەتانە.
- سولاح: ناوی (صلاح) ە.
- سەرو سەکوت: دەم و چاو.
- سەکۆ: دیوەخان، شوێنێکی دانیشتنی پیاو ماقوڵانی گوندە، بە زۆری لە تەنیشت یان بەردەرگای مزگەوت دروست دەکرێ، لە جیاتی کورسی لەسەری دادەنیشن.
- سمایل، سمایلە، سمە: کورت کراوەی ناوی (أسماعیل) ە
- سەربەردەزوورگ: بەردێکی ڕەقە لە گرد و زوورگەکان هەیە.

- سەلکە زورنا: سەری ئامێری (زورنایە).
- سەری ماش و برنجە: بەو مرۆڤە دەگوترێ سەری (ڕەش و سپی) تێکەڵ بێ.
- ساپ ساپانێ: یارییەکی مندالآنە.
- سلەستوور: گوو ئەستوور.
- سێبەرە گرگڕانی: یارییەکی مندالآنە، کاتی مانگە (شەوان) دەکرێت.
- سوندت لەسەرم نییە: سوندێکە، بەوشتە پیرۆزانەی کە تۆ باوەڕیان پێ دەکەی.
- سەری لە گریانێ کردییە: بەو منداڵە دەگوترێ هەردەم بگرییێ.
- سرێمان: سلێمان، سولەیمان، ناوی پیاوانە.
- سەگسار: ئاژەڵێکی دارستانە.
- سولاوکە: کونێکە یان بۆرییەکی تەنەکەیە لە سەرەوەی هەریەك لە ژووری خانووی لادێکان دروست کراوە بۆ ئەوەی ئاوی بارانی پیادا بێتە خوارەوە.
- سلحەوا: (کیسەڵ) لە (سلحفاە) ەوە هاتووە.
- سمێر بابڕ: بە سمێڵی گەورە دەگوترێ.
- سواندوکە: سەری لقە، کلکە.
- سەیوان: (چەتر)ی بارانە.
- سێ گاسن: ئامێرێکە لە دواوەی (تەراکتەر) (Tractar) دەبەسترێت و زەوی پێ هەڵدەکەنرێت.
- سمێرە خرتکە: (بزە خەنە)، پێکەنینێکی کەم، زەردەخەنە.
- سمێر فش: سمێڵ گەورە، جوێنێکە.
- سوژن: ئامێرێکی دورمانی دەستە.

- سەری پەنجەت مووی لێ بێ: دوعالێکردنێکی گەورەیە ئافرەت بەکاری دەهێنێ.
- سەری بۆزبووە: سەری مرۆڤ (ڕەش سپی) تێکەڵ بێ.
- سەرگین: ( پیسایی ئاژەڵە ) کاتێ ووشك دەبێتەوە.
- سام گرتی بووە: حەپەساوە، شڵەژاوە.
- ساچمە: ئامێرێکی (ڕاوکردنە).
- ساتمە: لەکاتی ڕۆیشتندا (پێ) لە شتێ گیربێ و هەڵبەزەیەك بکەی و نەکەوی.
- سارنج: بە شوێنی ((سارد)) دەگوترێ.
- سفت و سۆ: شوێنی برینێك بە ئازاربێ.
- سەڵتە: چاکەتی ئافرەتی بە ساڵاچووە.
- سوخمە: بەرگی سەرەوەی سنگی ئافرەتە.
- سندان دار: ڕزی، بۆگەنی.
- سەبوون: سەموون، لە (صمون) ەوە هاتووە.
- سەبری: ناوی ئافرەتانە، لە (صبریە) ەوە هاتووە.
- ستی : ناوی ئافرەتانە.
- سەکتە: ناوی ئافردتانە.
- سرپاتە: پاشماوەی (تۆچایە) لە دوای کوڵانی.
- ستوورك، ئەستوورك: لە نانی ساجی (تیری) کەمێك ئەستورترە.
- سەرەند: (هێڵەگ، بێژینگ)، کونەکانی لەو دوانەی ناوبراو درشترە، گەنمی پێ دەبێژن.
- سەروکۆکر: سەرو گێلاك، ڕووبەڕووبوونەوەی خاوەن کێشەکان بۆ سەریەکتری.

- سیلاح سز: بەو کەسە دەگوترێ لەبەر نوقسانی ئەندامێکی لەشی ((خزمەتی سەربازی)) نەیگرێتەوە.
- سمێری گووگردبوە: بەو ((هەرزەکارە)) دەگوترێ تازە مووی لە سمێڵی بە دیارکەوێ.
- سەخۆرکی سەی: بەکەسێکی پیس دەگوترێ.
- سەگ شیر: جوێنێکە.
- سارە وەختی بوو: بە منداڵی تەمەن یەك ساڵان دەگوترێ.
- سورتك: زۆرزان، هاروهاج.
- سەگ وەڕ: ((حەپینی سەگە))، یان بەکەسێك دەگوترێ لەکاتی دەمەقاڵێدا لە سنووری خۆی تێپەڕێنێت.
- سەرکۆنە: سەرزەنشت کردنە لە شتی ڕاست و هەڵە.
- ساقۆ: پاڵتۆ.
- سەبیلۆکە: بە منداڵی ((ساوا)) دەگوترێ.
- سەی دوو کاروانیان: بەو منداڵە دەگوترێ هەردەم بە دوای خانەوادەکەی و خزم و دۆست و برادەرو نەدیتەو نەناسییەوە بڕواو بەگەڵیان بکەوێ.
- سفرە: ١- بێ وەفا ٢- ڕایەخێکە ((نانی)) لەسەر دادەنرێ.
- سەرەدەری لێ دەرناکا: لێی تێ ناگا، شارەزایی لەو شتەنییە.
- سۆدرە: زۆرزان، قسەزان، سێبەندی.
- سەرت نەیەشینم: بێزارت نەکەم.
- سەری هاروماری: } بەیەکێك دەگوترێ هەموو
- سەری هێران و بنی گەواران: } شتێ لەژێر سەری ئەودابێ، ئاژاوەچی.
- سەگ ناسیتی: نەخۆشە.
- سەلکەستوور: سەرگەورە، جوێنێکە.

- سەرەدیقانێ: یەکێك ((بەبێ ئاگای)) کەسێکی تر جارجارە سەری لێ بێنێتە ژوورەوە و بیباتەوە دەرەوە.
- سەرمەقولاتە: تەقڵە لێ دان.
- سەرانگرێ بوو: وەرگەڕا.
- سەرتیلە: بەو شوێنە دەگوترێ کە لە کۆتایی خانوویەك دەسوڕێتەوە.
- سەحی کەوە: لێی بکۆڵەوە، تاقی بکەوە، سەیرێکی بکە.
- سەعی کە: بخوێنە، دەرس بکە.
- سۆتەك : پاشماوەی سوتانی توتنی جگەرەیە.
- سیقەدۆرە: (سیقەتۆر) ەی پەلەوەرو و باڵندەیە.
- سپی پاتِ: ئاچوغ، شتی کاڵ.
- سەردڕ: بەو کەسە دەگوترێ (شت زۆر کۆن بکات).
- سوورەی گەواد: بە مرۆڤی سوورو زەرد دەگوترێ.
- سەگ ساحێبی خۆی ناناسیتەوە: لە شوێنێکی قەڵەباڵغ کەس ئاگای لە کەس نەبێ.
- سندان لە کونی چاوت دا: جوێنێکە.
- سیلەك: تێك چووە.
- سەری وارایە: سەری کراوەیە.
- سەرت تراشن: بە مرۆڤی ((گاڵتەچی)) دەگوترێ.
- سۆماییت دایێ: (کۆرەبی)، جوێنێکە
- سەبانی: سەربان.
- سەوسوار: بە مرۆڤی (بەدڕەوشت) دەگوترێ.
- سۆریکە: سورێژە.
- سەی لە سەی: جوێنێکە.

- سەرت بە قەبری بابت: جوێنێکە.
- سوخەت: ڕەوشت.
- سەگ بنێ سەی: جوێنێکە، سەگی کوڕی سەگ.
- سەرو گێلاك: سەرو کەللە، دەم و چاو.
- سیوسیوە: چوار چێوەی دەرگایە.
- سەرکەلە: لە داوی خوری دروست دەکرێ، بە ملی (ئەسپ و ماین) دەوە دەکرێ، داوێکی درێژی پێوەیە بۆ ڕاگرتنی.
- سیرمە: بە مرۆڤی چیڕو چرچ و لاواز دەگوترێ.
- سێودین: ناوی پیاوانە.
- سوقی بۆوە: کەسێك شتێکی بە نرخی هەبێ و یەکێکی تر نەیبێ و هاوکات سووی بێتەوە.
- ساپیتە: ئەو دارەیەکە لەسەر سەقفی خانوی لادێ زیادبۆتەوە.
- سێ ڕسکانێ: جۆرە یاریەکی پیاوانە، لە نێوان دووکەس ئەنجام دەدرێت، هەریەکێکیان (٣) بەرد بەکاردێنێ.
- سەرچیغ: شوێنێك بە تەواوی خاوێن نەکرێتەوە.
- سیق و تیق: چاوەڕوانییەکی زۆر بکەی، بێ هیوا بوون.
- سەرتوو: چینی ((مەییوی سەروی ماستی هێوێن کراو و ئامادەکراو.
- سوکەرە: بەو کەسە دەگوترێ هەردەم (ئیشی) پێ بکەن.
- سوعال: پرسیار، لە (سۆال) دوە هاتوو.
- سێ بە سێ لە ناو مستی نا: تەلاقی دا.
- سکری: خەتی سەرەکی نێو شیناییە.
- سوڕ: بە تەواوی، بە ڕاستی.

- سرە: پاشماوەو پیسایی ئاژەلأنە کاتێ لە مەیدانی ئاژەلأن دەکەونە سەر یەك بە کۆمەڵ.
- سەرەناز: بەو جۆرە مافورە دەگوترێ (تایبەتە) خەڵك لەسەری دادەنیشێ.
- ساغە: بەو خاکە دەگوترێ لە کاتی هەلکەندن و قوڵ کردنی بگاتە (ڕەقە).
- سیکارد: چەقۆ، کێرد.
- سادانی: جۆرە سماقێکی ڕەنگ زەردە، دەنکەکانی لە سماقی سوور گەورەترو بە نرخترە.

## ﴿ش﴾

- شەقر: بریتییە لە پارچە لاکێشەیەکی لە دار دروست کراو دەسکێکی هەیە نزیکەی ((٣٥)) سم دەبێت، جاران بەکاردەهات بۆ کوتان و لێدانی گەنم.
- شرشێتەی لە ئوممەت نەچوی: بە کچ و ئافرەتانی کەم عەقڵ دەگوترێ.
- شینکە: گیای زستانەی تازە ڕواوە.
- شێرەکلۆ: جۆرە کوللەیەکی قەبارە گەورەیە.
- شیلم شاق: } جۆرد گیایەکە دەخورێت، گەلاکەی لە
- شرمی شاق: } (کەوەر) دەچێت.
- شەرتی هەرات: کاتی تەواوبوونی وادەی ((ماوەی)) شوانە لە شوانکاریەکەیدا.
- شەڵتە: لە مووی ئاژەڵ دروست دەکرێ، شێوەی لە( تۆڕی ماسی) دەچێت، جوتیار (کا) ی پێ دەکێشێتەوە.
- شلیف: ((٣هەتا ٥)) گونیە لە یەك دەدورێ ئینجا (کا)ی تیا دەکرێ.
- شەك: بە (مەڕی جاحێڵ) دەگوترێ.
- شوڕەشوڕی ئاوێ: خوڕەی ئاو.
- شفت و شۆی برد: حەیا و ناموسی برد.
- شەپرە: جەڵتە.
- شەفەلە: جۆرە گوڵێکی هاوینەیە.
- شەقرە: دارێکی باریکە لەسەر ((کاریتە)) ڕایەر دەکرێ.
- شەکرشکێن: ئامێرێکە (قەند) ی پێ لەت لەت دەکرێ.
- شریقە، شرینقە، شورونقا: ئامێری دەرزی لێدانە.
- شپڕێو : بەو کەسە دەگوترێ جل و بەرگی نارێك لەبەر بکات.

- شیش کوت: پڕ، قەراپەسەن.
- شەرم دایگرتییە: شەرم دەکات.
- شەکەرات: جۆرەکانی (کێك و نقوڵ و بنیشت و ترشی و شیرینی) یە.
- شاتکە شێت: بەکچ و ئافرەتی کەم عەقڵ دەگوترێ.
- شەرمەزار: خەجاڵەت.
- شەبەق: دڕاو، کەلێنی گەورە.
- شەق شەقە: ئامێرێکی یاریکردنی منداڵانە.
- شۆڕێ: ناوی ئافرەتانە.
- شیڕ: جرت لێدانە، فشەو گاڵتەکردنە بە قسەی بەرامبەر.
- شکایەت: شکات کردن، لە (شکوی) هاتووە.
- شێت و وێت: نەزان ، بێ عەقڵ، نەفام.
- شووشووی کرد: چاکی تێ هەڵدا.
- شوبرا: برای مێرد.
- شیشکە: ئامێرێکی دەستە، لیفکەو بلوزو کڵاو.. پێ دروست دەکرێت.
- شەوا شیك: جۆرە گیایەکە بۆ سووتان بەکاردەهێنرێ.
- شوللاق: شاپی گەورە، ((شا+لاق)).
- شەوەر: شەومانەوەی مەرداران لە شوێنێ کە ئاوی هەبێت و کۆچ کردنیان لە تاریك و ڕوون بۆ هەواری گەرمیان .
- شایەر: گۆرانی بێژی میللی، گۆیندە.
- شەنە: دارێکی لك درێژە سەرەکەی (٣-٤) لکە بۆ هەڵدانی سێلکەیە بەرەو ((با)) تا ((دانەوێڵە)) لە بەڵمەکان جودا دەبێتەوە.
- شەغرە: وەك (پەیژە) وایە قرشەی پێ دەگوازرێتەوە لە پەرێزەوە بۆ سەر جۆخین.

- شانەشین: سەکۆیەکە لە بەردەم گەورە مالآن دروست دەکرا.
- شون هەرگر: ڕێ نیشان دەر.
- شوان کارە: کرێ گرتەی مەڕ و مالآتە.
- شوق خۆی هاویشت: بە کەسێك دەگوترێ لە هەموو بوارێکدا دەست پێشخەر بێ و قازانج بکات.
- شرو وور: بەو مرۆڤە دەگوترێ گرنگی و بایەخ لە جل و بەرگ و شێوەی دەرەوەی نەدات.
- شوعی: حیزبی شیوعی.
- شەپڵتە: شاپلیتە، تۆپەڵە.
- شەشەران: شەشەلآن، شەشەکان، بە ڕۆژوبوونی موسڵمانان دوای ((٣٠)) ڕۆژی مانگی ڕەمەزان.
- شەرمێ لە خۆناکەیەوە: بەو کەسە دەگوترێ قسە یان کردەوەی خراپ ئەنجام بدا.
- شل و شۆق: بە کەسێکی لەش خاو دەگوترێ.
- شەگەو پەگە: بە مرۆڤی بێ کەلك دەگوترێ کە نەتوانن هیچ جۆرە کارێ بە ڕێك و پێکی ئەنجام بدەن.
- شلم کۆر: بەبێ دیقەتی ، هەر ئاوەها.
- شەق و پەق: شتی تێك چوو، بێ سوود.
- شەللاتی: بە مرۆڤی ((بەرەللآ)) دەگوترێ.
- شەت و پەت: بەوکەسە دەگوترێ قسەی بێ مانا بکات.
- شەلەی قوون خوار: بە مرۆڤی شەل دەگوترێ.
- شەربە: گۆزە.
- شۆرابە: هاتنە خوارەوەی ئاوە بە کەمی لە سەرەوە بۆ خوارەوە.

- شەمووله: بە مرۆڤی کورتە باڵا دەگوترێ.شاپ: شەق لێدان بـە ((پـێ)) پـێ لەقە.
- شەکرلەمە: جۆرە کێکێکی خواردنە.
- شرو شارات: ووردەواڵەی ناو ماڵ.
- شیرتێن: ناوی ((ساردو گەرم)) بە تێکەڵاوی.
- شیڕو هۆڕ: دەنگە دەنگ، تڕ.
- شە: شانە.
- شوون بزر: بزر، وون.
- شەفیق: ناوی پیاوانە.
- شرپەی هات: بەربووەوە.
- شکارتە: پارچە زەوییەکە نزیکەی (نیو) عەربە دەبێت.
- شیربایی: ((پارەی کچ بە شودانە)) کە وەردەگیرێ و دەخورێ.
- شەب و مازی: دەرمانێکە بۆ (دەم کولی) بەکاردێ.
- شەوبەکێ: (مەڕو بزن) لە وەڕاندنە بە شەو.
- شەویلاگ: ئەم لاو ئەو لای خوارەوەی لێوی مرۆڤە.
- شێت و هار: ١- جۆرە نەخۆشییەکە ٢- بۆ گەشەی گەنم و جۆ دەگوترێ.
- شلکێنە: جۆرە نانێکە، سەرەتا ڕۆن لەسەر ساج ڕوو دەکرێت ئینجا هـەویری شلی پانەوەکراوی بەسەردا دەدرێت.
- شوورك: لکەداری درێژی نەرم و شلە.
- شنك : شواشینك، جۆرە دەوەنێکە.
- شـیرباق: ڕۆنـی کـونجی، ئـەو فانۆسـەی جـاران کـە بـە ڕۆنـی کـونجی کـاری کردووەو لە کارێزەکان بەکارهاتووە و دووکەڵیشی نەبووە.
- شاقۆر: بە (تونێلی کارێز) دەگوترێ.



- عەگید: بە (ئەسپی ڕەسەن) دەگوترێ.
- عومێرە: جۆرە گەنمێکە بە دێمی دەڕوێت و دەچێنرێت.
- عنـــدر عـــۆپ: یاریـــەکی منداڵانـــە، لـــە ((Under-up) ەوە هـــاتووە، بەرزبوونەوەو دابەزین.
- عەبای لۆکرد: هیچی پێ نەهێشت.
- عینگ: خۆ پێوەنان بە بێ ئەدەبی .
- عەوڵا: } ناوی ((عبدالله)) کورت کراوەکەیەتی.
- عەبۆ:
- عەول: کورت کراوەی ناوی ((عبدالقادر))ە
- عاجباتی: بە شتی سەیر دەگوترێ.
- عولعولی: بە ئافرەتی گێل دەگوترێ.
- عەلۆ: کورت کراوەی ناوی ((عەلی)) یە.
- عالۆری: بەڕەڵڵا.
- عەنتیکە: ئەنتیکە، شتی سەیر.
- عەشتەبای خوای: هیچ شتێك.
- عەمبارە سۆت: قوماشێکی کون کونە، جارێك بشۆردرێ دەدرێ.
- عەییز: ناوی ((عەزیز))ە
- عانەك: پارەی کۆن، ((ئفلس))ە.
- عەرزو عار: (عەریزە) داواکاری لەسەر دەنوسرێ لە فەرمانگەکان.
- عەمر درێژبی: تەمەن درێژبی.
- عەیشێ: ناوی ئافرەتانە، لە ( عائشە) ەوە هاتووە.

- عەمی کە: (بخۆ) بە منداڵ دەگوترێ.
- عەتەلە: پشوو، لە (عطلە)دوە هاتووە.
- عەمەلە: کرێکار.
- عەشریق و مەشریق: هەموو لایەکی دونیا.
- عازەب: بەو کچە دەگوترێ شوی نەکردبێ.
- عوزێر: ناوی پیاوانە.
- عەلە: کورت کراوەی ناوی (عەلی) یە.
- عەلاوەدین: ١- ناوی ((عەلا الدین)) ٢- بە سۆپای (علاالدین) یش دەڵێن.
- عەمرە: ١- سوونەتێکی تەواوی ئیسلامە، موسڵمان لە ماڵی خوادا ئەنجامی دەدەن. ٢- ناوی ئافرەتانە.
- عێدز، عێجز: زویر، توورە، بێ تاقەتی.
- عەن: (ئۆتۆمبێل) منداڵی ساوا بەکاری دەهێنێ.
- عاسمان: ئاسمان.
- عایج بووە: هاربووە.
- عەلەلیش: عەلی شیش.
- عەلی کۆپتەر: هەلی کۆپتەر.
- عەتی کە: (لێی دە) منداڵی ساوا بەکاری دەهێنێ.
- عەلەتریک: ئەلەتریک، کارەبا.
- عەرد: ئەرز، زەوی.
- عالفە: ڕۆژی پێش جەژنی ڕەمەزان و قوربانە، لە (عرفە) وە هاتووە.
- عەربە: هەشت(٨) قەسناغە گەنم و جۆیە، بە (ڕبە) دەپیورێ.
- عوربان: هۆبە، کۆمەڵە ڕەشماڵێکە.



- غەرابە: گردۆلکە، ناوی گوندێکە لە کەندیناوە.
- غەرگە: لە (سەڵتە) (کەوا) ی مەلایان دەکات بەلاّم جوتیار و سەپان بۆ کارکردن بەکاری دێنن.
- غەربیل: هێلەگە: بێژینگ، سەرەند، قوم و چگلی پێ دەبێژرێ.
- غەدداری گەورە: زۆرزان، فێڵباز.
- غودبە: خوتبەی هەینی موسلمانان، لە (خطبە) وە هاتووە.
- غلۆر بۆوە: شۆڕبوەوە.
- غام: لە یاریی دا مانای (گێم) دەبەخشێ.
- غاری دا: ڕایکرد.
- غەردارە: جۆرە گیایەکە دەخورێ.
- غشۆلە: خشینی لەسەرەخۆ لەسەر زەوی.
- غەزری : بە ئاژەڵی بارهەلگر دەگوترێ کاتێ خاوەنەکەی هەوڵی ڕۆیشتنی لەگەڵ دەدات بەلاّم ناڕوا و لە شوێنی خۆی دەچەقێ.
- غەل و غەش: فرت و فێڵ.
- غەرغەرە: شلەقان و بادانی ئاو لەم لاو ئەولای ناو (دەم).
- غەرەت: هەڵە، لە (غلط) ەوە هاتوە.
- غەدرو غدور: چەوساندنەوە.
- غایەن: خائین.
- غەروز: خەڵوز. ڕەژوو.

## (ف)

- فۆته: شالْ. چەفیه
- فاق: تەڵەیەکی بچوکە، چۆلەکە و کۆتری پێ ڕاو دەگری.
- فاتم: ناوی ئافرەتانە، لە (فاطمة) وە هاتووە.
- فتیله: پارچەیەکی کورتە لەبەن دروست کراوە، دەخرێتە ناو گیزەی فانوس و لامپاوە، لای سەرەوەی دادەگیرسێنری بەمەبەستی ((ڕوناك کردنەوە)).
- فرانەکەس: فلاّن کەس، ئەو کەسە.
- فلکەی ئاوی کەسك و سۆر: (نافورەی کۆن) چوار ڕیانی ئێستای (هوتێلی شیراتۆن) ە.
- فەڕڕاح: بە شوێنێکی بەرین و فراوان دەگوتری.
- فیت فیتە: فیکە. فیقە.
- فیتو هۆڕی جغارەیتی: بە جگەرەکێش دەگوتری.
- فنەفن: لووت پاککردنەوەیە لە پیسی.
- فرفرۆك: کەل و پەلی پێویستی جووت و جەنجەڕە.
- فەریك : پێش کامل بوونی (گوڵەگەنم و جۆ) یە.
- فەرەقەتێ: فەرخەی قەتێ.
- فەقیرو فەقارات: هەژارو لێ قەوماو.
- فسە زمان: بەو کەسە دەگوتری قسەی بەباشی پێ نەکری و دەربڕینی هەندێ پیتی لەلا زەحمەت بێ و بە جۆرێکی تر دەری ببڕێ.
- فرتەی دێ: بە ئاسانی دەچێتە ژوورەوە.
- فووی لێ کە: فووی پیاکە.
- فڕوجاو: چەلاو، (مەرەگە)ی پەلەوەر.

- فینگەفینگ: بە گریانی مرۆڤ دەگوترێ.
- فسەفسی خەوێیتی: خەوی دێ.
- فەرشە: هەویری لەسەر پان دەکرێتەوە بۆ نان کردن.
- فرانە کەسیشی تێ نابی: وەکو ئەویشی پێ ناکرێ.
- فەراقی لێ برِا: مرد.
- فاتە رِەشە: سپڵ.
- فێسەر: ناوی (فەیسەڵ) ە.
- فەرِەنگی: فەرەنسایی، مەبەست لە ئەورووپاییە.



- قەلەندەر: هەژار، داماو.
- قسەی لە قسەی دەکا: کەسێکی تەمەن بچوك قسە لە کەسێکی لەخۆی گەورەتر ببڕێت و بکات لە کاتی ئاخاوتندا.
- قاڤ هاتییە: کات (وادە) ی هاتووە.
- قجەقجە: کەم کەمە.
- قرقرە: لە ملی (مەڕ) دەکرێ وەکو (زەنگوڵ) وایە دەنگێکی مۆسیقی هەیە.
- قوونە خشکە: منداڵی ساوا کاتێ لەسەر(قوون) دەخشێ گاگۆڵە دەکات.
- قوون لێ کەتیی: بە مرۆڤی تەمبەڵ و بێ ئاگا دەگوترێ .
- قۆشمە: غاردانی (ڕەشە وولاغ)) ە.
- قانات: هەردوو لا دیواری سەر بیری ئاوە.
- قەیرە: ((پیرە بەران)) ە، هەروەها بە کچانیش دەگوترێ کە گەورە و بە تەمەنن.
- قەدری عافیەتی نازانی: بەو کەسە دەگوترێ قیمەت بۆ شتێ دانەنێ کە پێشتر سوودی لێ بینیبێ.
- قاڕوش: جۆرە دارێکە لە قامیش دەچێ کاتێ گوڵ دەردەکات لە دار گەسك دەچێت، لە قەراغ ڕووبار شین دەبێ.
- قاقەز: کاغەز.
- قدیلانە: ختووکە.
- قورپ: دەسك ، قوڵپ.
- قوڕباقە: کۆکینی بە هێزە، کاتێ گەروو بەیەکەوە دەنووسێ.

- قەسری: کەسێك لە کەشێکی زۆر ساردا سەرمای بێ.
- قەمەرە: ئۆتۆمبیلی بچوك.
- قنج: } ڕێك و پێك و جوان.
- قشت:
- قوتە قوت، قەتکە قەتك: سەر دەرهێنان و بەرزکردنەوە بۆ سەیرکردنی ناو مالآن.
- قەیناغ: وەکو ئەنگوستیلەیە، سەپان و پالەکان لەکاتی دروێنەدا لە پەنجەی دەکەن.
- قەسپۆك: خاکێکی ڕەقی هەلوەشاوەیە.
- قل: دەنك، دانە.
- قیناج: ئەو قوژبنەیە لە مەترێك کەمترە، درێژو پانیی وەك و یەك نییە.
- قورفانگە: گرێەکە بە ئاسانی دەکرێتەوە.
- قەسناغ: ((٤)) ڕبەی دانەوێلەیە.
- قەرێتە: مل پێچێکی پزیشکییە لە ئیسفەنج دروست کراوە بۆ ڕاگرتنی ملی نەخۆش بەکاردێ.
- قسەت بە شەکربی: لەکاتی گفت و گۆکردندا قسەی بەرامبەرەکەت ببڕی.
- قالدرمە، قاندرمە: پێپلیکانە، پەیژە.
- قونك: لای دواوەی هەموو جۆرە سەوزەوات و میوەجاتێکە.
- قورنە: قوژبن، قولینچك.
- قەلغە: ژوورێکی بچوکە (سەرباز) لەناویدا دەگوزەرێنن.
- قوتاربوو: ڕزگار بوو، دەرچوو.
- قەرپ: هارو هاج.
- قەدەنینەك: دەستەیەك، قەدێك (نوێن).

- قیرپرسی: دەباوابێت، قەیناکا.
- قەیدی نییە، قەیدێ ناکا: قەی ناکا، قەی چی ئەکا.
- قەبرستان: گۆڕستان.
- قــەلۆغان: ڕووەکێکــی دڕکاوییــە، دوای خــاوێن کردنــەوەی ســەرەکەی دەخورێت.
- قەڕاسە: جلەوی ئاژەڵە.
- قیلم قازێ: جۆرە یارییەکە، گەورە منداڵی بچوك دەهاوێتە سەر ملی خۆی.
- قاژقاژە: جۆرە باڵندەیەکە.
- قەستەقول: (قەرسەقول) ، پیسایی گوێ درێژ و ئەسپ و .........
- قرمــسا: بەیــەکێك دەگــوترێ لــە کــاتی نــەخۆش کــەوتنی ، ددانــەکانی بــە یەکترەوە نوسابێ و دەمی نەکرێتەوە.
- قەشمەر جاڕی عالەمێ: گاڵتەجاڕی خەڵك.
- قەفرا: گەرم.
- قاتی بوە: نەماوە، بڕاوە، شتێ لە بازاڕ دەست نەکەوێ.
- قالە: کورت کراوەی ناوی ((قادر))ە.
- قۆرت: چاڵ.
- قەمپار: قەمپاڵ، گازگرتنی ئاژەڵە.
- قۆڕەی دێ: (سك) کاتێ لە برسانا دەنگێکی لێوە بێ.
- قولاغ: هەست ڕاگرتنە.
- قوون بە دووکەر: بە پیاوی (کەتن کەر) دەگوترێ.
- قوون بە گێچەڵ: بە پیاوی (گێچەڵ کار) دەگوترێ.
- قەمتەرە، قەنتەرە: دەرگایەکی گەورەی حەوشەیە، لە تەنەکە یان لە دار دروست کراوە.

- قەنارە: شوێنی بە پەتەوەکردنە.
- قەسەم بە خوای: سوێندێکە.
- قاوی دا: دەری کرد، لای دا.
- قیس: بەش.
- قورینگ: باڵندەی (قولنگ) ە.
- قێزبەلە: خواردنێکە بەهاران دەخورێ.
- قوچ ئاگر: (٣بەردە) لەسەر زەوی دادەنرێ بۆ کاری (چای و چێشت لێنان) لەسەری دادەنرێ.
- قابیلە؟!: ئەی چۆن؟! وایە، ئاوەهایە.
- قۆپەنەی کردییە: کاتێ دەغڵ و گیا چرووپر دەبێت.
- قرغ بوو: دۆڕا، هیچی پێ نەما.
- قڕانەك: دراوێکە.
- قڕانی هاتییە: نەمانی هاتووە.
- قولەتێن: ئاوێکی لێڵە، بۆ مەبەستی جۆراوجۆر بەکاردێ.
- قەهر: خەفەت، داخ.
- قۆنـــدەرەی بـــە پەنجـــەرە: پێڵاوێکـــە لـــە پلاســـتیك دروســـت کـــراوە، دەوروبەرەکەی لێکراوەتەوە و شێوەی پەنجەرەی وەرگرتوە.
- قەپرغە: کەلاکە، کەلەکە.
- قاشقاش: پارچە پارچە.
- قەلاقوچکە: تەقڵە.
- قەوانگ: بە شاخی ( مەڕ یان بزن) دەگوترێ کاتێ (کلۆر) دەبێ.
- قینچکە: (جوانکە)، لە دەم و چاوی کوڕو کچی لاو پەیدا دەبێ.
- قرتێنە: قلپ هاتنەوە.

- قۆرنج: قۆڵنج، شان و شەپیلك.
- قاشوانێ: جۆرە یارییەك.
- قوتیل: بە مرۆڤی بەژن و باڵا کورت دەگوترێ.
- قۆغە: بەرداخی نایلۆنە.
- قازی بازاڕ: جۆرە زیندەوەرێکی بچوکی ڕەنگ سەوزە، قەبارەکەی بە قەد (قالۆچەیەك) دەبێ و توانای فڕینیشی هەیە.
- قازمە: ئامێرێکی زەوی هەڵکەندنە.
- قەتماغە: چینی ڕەقەوە بوی سەرەوەی پێستی مرۆڤە دوای برینداربوونی .
- قشپل: پشقل.
- قونجرکە: ۱- ڕووەکێکی دڕکاوییە گەڵاکەی لەسەر زەوی پەرش دەبێتەوە. ۲- نوقرچە.
- قەیرە کیژ: بە کچی تەمەن گەورەی مێرد نەکردوو دەگوترێ.
- قادە: لە دار دروست دەکرێ و داوی تێ دەخرێ.
- قسەیتی: ڕاست دەکات.
- قەحپەشیر: جوێنێکە.
- قەرەپەستانێ: شوێنێکی قەڵەباڵغ.
- قوچەك: بەردێکە بۆ نیشانکردنی سنورەکانی زەوی دادەنرێت.
- قونی تۆتکەی ناگری: بەو کەسە دەگوترێ هەر لە جوولە دابێ و دانەنیشێ.
- قرچۆك: بە مرۆڤی (ڕەزیل) دەگوترێ.
- قەت ڕاستەڕێ نابی: شتێك چاکبوونەوەی بۆ نەبێت.
- قوززەلیخ: جوێنێکە، سەرزەنشت کردنە.
- قولینچك: قوژبن.
- قەلاربۆوە: مرد.

- قوونەجۆرە: بەهەردوولا پەراسووەکانی گۆشتی مریشك دەگوترێ.
- قیامەتت لی هەستی: جوێنێکە، سەرزەنشت کردنە.
- قوون پانی: پاژنەی پێ.
- قوتە: ئەو (کارە بزنە) ی لە زگماکەوە لە دایکی دەبێ بە گوێ کورتی.
- قەوم و قیلە: عەشیرەت.
- قونێر، قولێر: گرێیەکی بچوکە بە قەد کەلا شووشەیەك دەبێ، لەسەر پێستی مرۆڤ پەیدا دەبێ.
- قرێژ: چڵك، پیسی سەر پێستی مرۆڤ.
- قەلەزراو: ترسنۆك.
- قەدەرەگە: ماوەیەکە.
- قەدری: ناوی ئافرەتانە، لە (قدریە)وە هاتووە.
- قەمەندۆر: جۆرە قوماشێکی ڕەشە.
- قرنە: زیندەوەرێکی بچوکە بە گوێی ئاژەڵەوە دەنوسێ.
- قەلاقوپ، قوورپوقەپ: بێ دەنگی، بێ قسە.
- قاسید: نێردراو.
- قرشە: دەغل و دان کە دروێنە کرابێ، بەلاّم نەکوترابێ.
- قرشەشکێن: یەکەم کوتان بۆ گەنم و جۆ.
- قەرانگ: دارێکی تایبەتییە بۆ کۆکردنەوەی مەلۆکان بەکاردێ.
- قوڵتە: جۆرە باڵندەیەکە.
- قاویت: گەنم دەبرژێنرێ ئینجا دەکوترێ دواجار بۆ (شەوچەرە) لەگەڵ خورما دەخورێ.
- قیڕە بڕی کرد: نەیهێشت، کوشتی.
- قازوخ: بە واتای (سنگ) دێ، ووشەیەکی تورکییە.

- قاوقاوانێ: جۆرە یارییەکە.
- قرمسان: ڕەق بوون.
- قرج و بڕی کرد: پارچە پارچەی کرد.
- قزگە: چەقی (ناوەڕاست) یاریگای یاری هەلووکێن.
- قەردی سەرپەڕێ: کاتێ خەڵك قەرد دەدەنەوە یەکتری بە تایبەتی دوای گرانی بەسەرچوون دواجار دڵیان خۆش دەبێ و یارمەتی یەکتری دەدەن



- کۆرەبژ: مێرد مندالٚ ، هەرزەکار.
- کەشخە: جوان.
- کەلەکە: کەلاکە، هەردوو تەنیشتی ڕاست و چەپی ژێر قەفەزی سنگ.
- کەڕك: (سەپان) بۆخۆ پاراستن لە تیشکی خۆر لەسەر جل و بەرگ لەبەری دەکەن.
- کوندە: پێستی غاراوی ((مەڕو بزنە)) بۆ ئاو خواردنەوە بەکاردێ.
- کۆتك: وەك جامی ئاو وایە لە دار دروست کراوە بۆ خواردنەوەی دۆ و ماستاو بەکارێ.
- کیتەڵ: گۆزمیەکی خڕی بچوکە.
- کیستان: کوێستان.
- کز: ١- بێ زەوق ٢- لاوازو بێ هێز ٣- کەم، نزم.
- کێلە: بەردانێ: یاریەکی کوردەوارییە گەنج و پیاو ئەنجامی دەدەن.
- کۆراییت داینێ: کۆرەبی، جوێنێکە.
- کورو کۆی دامرکایە: تەواو سووتاوە.
- کوڕڕش: بانگ کردنی جاشك (بێچوی گوێ درێژە).
- کاریتە: داری ئەستورو گەورەی سەر خانوی قوڕە.
- کۆس مالۆس: بە یەکێك دەگوترێ ڕیش و سمێلی تاشی بێ.
- کوپە: لە بەردو قوڕو گەچ دروست دەکرێ، هاوینان ئاوی تیا دەکرێ لە ژێر کەپریان شوێنێکی فێنك دادەنرێ بۆ ئەوەی ئاوەکە فێنك و ساردبێ ئینجا ئاوی لێ دەخورێتەوە.

- کوچ کوچە: بەو کەسە دەگوترێ لەکاتی سەفەرکردندا هەردەم بە دواوەی کەسێکی تروە بێت.
- کۆق قیت: کلاو بەرز.
- کولانکە: دەلاقە، کونێکە لە ناو دیواری ژوورەوەی خانوو دروست دەکرێ.
- کت و کۆر: بە کەسێکی (کەم بین) دەگوترێ.
- کۆترۆکە: لە نەخش و رازاندنەوەی ئافرەتان بەکاردێ.
- کرتی: جۆرە گەسکێکی سەرتیژە لە دار دروست دەکرێ.
- کۆز: کۆلێکی درێژو باریکە، ئالیکی (کاروبەرخی) تیا دەکرێ.
- کۆل: شوێنی ئاو خواردنەوەی مەڕو مالأتە.
- کاردییە ڕیخنە: گیایەکی بەهاری تاڵە و بێ سوودە.
- کیژخان: ناوی ئافرەتانە، بەو کچە دەگوترێ کە لەناو خێزاندا خۆشەویستە.
- کەتیتە بن باری خەمێ: بە کەسێك دەگوترێ خەمێکی زۆری هەبێ.
- کەنگری قومەران (قاس) گیایەکی بەهاری باریك و ناسکە لەگەڵ ڕوونی سورەوەکراوە لێ دەنرێت، هەروەها لەگەڵ ساوەریش لێ دەنرێت.
- کاردی گێ بەرخە: گیایەکی بەهاری بە سودە، لەگەڵ گەنمی کوتراو لێ دەنرێ و بە تەنها لەگەڵ برنج بە ڕەشی لێ دەنرێ.
- کەنگرە ماسی: گیایەکی بەهارییە، گەڵاکەی ناسك و لووسە، لەگەڵ ڕۆن سورەوە دەکرێت و بە ساوەریش لێ دەنرێ.
- کارەمێشکە: بەو منداڵە ساوایە دەگوترێ لە ماڵەوە هەردەم لە جوولەو هات و چۆدا بیت هەرگیز دانەنیشێت.
- کردیتیە ڕۆژی خۆی: بە کەسێکی سوعبەتچی دەگوترێ لەناو مەجلیسدا.

- کەمییە: نەفس نزمییە.
- کەبەر: گیایەکە لە جیاتی قەسەر بەسەر خانوی قوڕدا ڕادەیەخرێ.
- کەربەشە: جۆرە گیایەکی بەهارییە، گەڵاکەی پانە، تامی شیرینە وەکو (توور) وایە.
- کەرکۆر: جۆرە گیایەکی بەهارییە، قەدەکەی بەرزەو دڕکاویشە.
- کەلەنی ناداتێ: بەو کەسە دەگوترێ لەهەموو شتێ (کارێ) مەجالی کەس نەدات.
- کۆتان: چەپەر.
- کەرکید: ئامێرێکە لە دروستکردنی (تەون) بەکاردێ.
- کوندە: (پیستەی بزنە) ئاوی خواردنەوەی تیا دەکرێ.
- کەچە: کۆنە، شتی بێ سوود.
- کوندەران: کە پرێکی بچوکە هاوینان کوندەی لەسەر دادەنرێ.
- کۆپار: ١- هەر شتێك کۆمەڵ بکرێت و کۆ بکرێتەوە و بەرزاییەکی هەبێت ٢- بە بەرزی حوشتریش دەگوترێ.
- کەوس: سندان.
- کوتکە، مێکوتە: جۆرە ڤایرۆسێکە ماوەی (٣-٥) ڕۆژ لەسەر پانتایی پێستی مرۆڤ بە شێوەی خاڵ خاڵ دەمێنێتەوە، مرۆڤ لە ژیانی دا یەك جار تووشی دەبێت دواجار نامێنێ.
- کۆچك: پارچە قوماشێکە: منداڵی ساوای پێ لەچك دەکرێ.
- کەلکی سەی نەمایە: جوێنێکە، بە منداڵی هاروهاج دەگوترێ.
- کەلم و کورم: پارچەپارچە.

- کەوەڕێ بوو:
- کواسی برد: } مێشکی چوو لە غەڵبە غڵبی و قەڵەباڵغی خەڵك.
- کەڕە: بەو (مەڕە) دەگوترێ گوێی زۆر کورت بێ.
- کاوڕ: لە (بەرخ) گەورەترە.
- کوڕیس: ئەو (مەڕو بزنە)یە گوێچکەکانیان نە درێژەو نە کورتە.
- کوور: (نێرەی بزن) کە بەتەمەن داکەتبێ.
- کرتی: جۆرەگیایەکە لە ژێرەوەی بڕکە شووتی دەڕوێت، زیانی هەیە (شووتی) کون دەکات.
- کودەرە بەراز: بێچوی ئاژەڵی (بەراز)ە.
- کڕکانی ناکا: دەنگ ناکات.
- کەرەبابە: کاتێ (شووتی) برکەکەی تەواو گەورە دەبێ بەقەدناو لەپی مرۆڤی لێ دێ، ئینجا (سەرەتوولە) دەردەکات و بەرەبەرە درێژ دەبێ و گوڵ دەردەکات.
- کولیچە: بەری (شووتی) تازە سەر دەردەکات هەتا گەورە دەبێ.
- کونجەخانی: بو ژووری تەسك و زۆر بچوك دەگوترێ .
- کەڕە کرمانج: بە خەڵکی گوندو دێهاتی ڕەسەن دەگوترێ.
- کاپێلکە ستوور: بە مرۆڤی دەم و چاو ئەستوور دەگوترێ.
- کەنگر: } دوو جۆرە گیای بەهارین، دەخورێن.
- کاردی:
- کەور: بەو پیستە دەگوترێ لە کاتی ئاژەڵ سەر بڕین لێ یەوە جودا دەکرێتەوە، بۆ مەشکە و کوندە و پێڵاو بەکاردێ، هەروەها فەرشەی نان کردنی لەسەر دادەنێن و ئاردی لەسەر ڕوو دەکەن.
- کەرخی دیارە: شوێنی دیارە.

- كونەبا، كوشەبا: بە مرۆڤی (درۆزن) دەگوترێ.
- كوارگ: قارچك، خواردنێكی زۆر بە تامە.
- كالۆ ئەو ڕۆژەی؟: بریا ئەو ڕۆژە دابهاتایە؟.
- كەشك: جۆرە خواردنێكە لە (ماست) دروست دەكرێ.
- كەوێ: (كەوا) ی ئافرەتان.
- كەوێ و سەڵتە: بەرگی مەلای دوازدە عیلمە.
- كەڕك: پەستەك، لە (موو)ی ئاژەڵ دروست دەكرێ.
- كۆندڕ: چاڵ.
- كەودەری: نەزان.
- كۆریت: شوێنی حەوانەوەی (سەگ و پەلەوەر)ە.
- كودەری: جۆرە قوماشێكە.
- كەرەگیفە: كەڕوو .
- كڕی بن بڕ: بەو كەسە دەگوترێ لە (سەرەوە) عاقڵ خۆی نیشان بدا و لە (ژێرەوەش) هاربێ.
- كەسێ خاری: خزم و كەسی (خاڵ)، هەموو كەسی (خاڵ).
- كەپوو: لووت.
- كۆی هۆی: (شوان) ئەو ووشەیە بۆ تاودانی مەڕومالآت بەكاری دێنێ.
- كەلەن: درز، كەلێن.
- كەڕەسیسانێ: قەڵەبالغ.
- كت و مت: وەكو ئەو، لەیەكچونی دوو كەس یا دوو شتی جیاواز.
- كراشەی دەكا: گەلێ زۆرە.
- كەرەمستانێ: كەڵەمستێن، جۆرە یاریەكی كوردەوارییە ((گەنج و پیر)) لە نێرینە شەوانە ئەنجامی دەدەن.

- کافری پێ بوسورمان دەبی: دڵ سووتانە بە کەسێکی غەدر لێ کراو.
- کخە: پیس، منداڵی ساوا بەکاری دەهێنێ.
- کزر: شتێك نەتەڕبێ و نەووشکیش.
- کەستەك: بەیەك گرتنی کۆمەڵە خۆڵێك دەگوترێ لە کاتی ڕەق بوونی.
- کیژۆرە: بە کچی تەمەن بچوك دەگوترێ.
- کوڕیژگە: بە کوڕی تەمەن بچوك دەگوترێ.
- کۆش: باوەش، ئامێز.
- کوو بای هەرەدا با؟!: بە مرۆڤی جگەرەکێش دەگوترێ.
- کەینێ، کەنگی؟: کەی؟.
- کاسنجی: جوێنێکە.
- کفتی دری خۆی پێ دەرکرد: } ئاسودە بوو، دڵی ڕەحەت بوو.
- کۆری خۆی پێ ڕێشت: } ئاسودە بوو، دڵی ڕەحەت بوو.
- کەروبارت بەخێر: بە یەکێك دەگوترێ درەنگ بگاتەجێ.
- کوتەکوت: دەنگە دەنگی بەردو چەکوش لێدانە.
- کشتەك: ئەو داوەیە ئافرەت مووی پێ هەڵدەگرێ.
- کونجرکونجر: کون کون بوونی سەر پێستی دەم و چاوی مرۆڤە.
- کورکن: بە مرۆڤی (توکن) دەگوترێ.
- کچەتیم: بانگ کردنی (کچە) لەلایەن مرۆڤەوە.
- کەلاك: پاشماوەی بۆگەنی لاشەی مردووە.
- کەم دوو: بەو کەسە دەگوترێ کەم قسە بکات.
- کڕکەتییە: کڕکەوتووە، هەڵیشتنی باڵندەو پەلەوەر لەسەر هێلکەی دانراو.
- کای؟: لە کوێی؟.

- کۆپەران (بارینە): لە پیستەو لبادو قایش دروست دەکرێ و دەخرێتـە ملـی وولاغەوە.
- کۆروهۆر بویتەوە: وێران و خاپور بووە.
- کوکوختی: کۆترە باریکە.
- کوچکە بەرد: بەردێکە قەبارەکەی لە (نیو کیلۆ) کەمترە.
- کژی هاتییە: کاتی هاتووە.
- کۆمەرەك: کۆمەلێك.
- کوو؟: چۆن؟.
- کادین: ژوورێکە (کا)ی تیا دەکرێ.
- کولە مەرگی: ژیانێکی زەحمەت.
- کیژ کوڕ: بە کوڕی جوان دەگوترێ.
- کرۆر: جۆرە (کاردیە) کەلەسەر بەرد دەردەکەوێت.
- کلك پان: بە کچ یان ئافرەتی مەکربازو زۆرزان دەگوترێ.
- کەروبارت بەخێر: بەیەکێك دەگوترێ زۆربلێیی واتە دیسان هاتیەوە.



- گرویێرەك: پارچە قوماشێکە لە ژێر هەنگلی کەواو کراسی ئافرەتان دەدرێت.
- گێ فرکانێ: جۆرە یاریەکە.
- گۆشت لە برانە: بێ حیساب زۆرە.
- گولە: ئەو پیاوەیە کە ژنەکەی پەسەندی ناکات.
- گی مەدێ: گوێی مەدێ.
- گازمالوکە: سەری فاقە (تەڵە)یە.
- گرگرگرگر هاتەوە: دیسان هاتەوە.
- گەلەك دۆخەیە: کێشەیەکی گەورەیە.
- گێلە وێژە: گردبوونەوەی خەڵکە لە ناو یەك بەنارێکی لە کاتی کێشە.
- گوجیلە: تووتکە سەگ.
- گژو ووژ: بە ئیشی (ناو ماڵ ) دەگوترێ.
- گرگرە: ئەو شتەیە کە گوریسی سەر دۆڵابی بیری ئاوی لەسەر دادەنرێت.
- گیا سۆتکە: جۆرە گیایەکە لە ناو شینایی و قەراغ ڕووبارەکان هەیە، ئەم جۆرە گیایە تایبەتە بە خواردنی ئاژەڵی (بەراز).
- گورگە: جۆرە گیایەکە ڕەنگ زەردە، لەناو شینایی دەڕوێت، زیانێکی زۆری هەیە بۆ (تەماتە).
- گیا سۆرە: جۆرە گیایەکە لە ناو شینایی دەڕوێت، تەنها ئاژەڵ دەیخوات.
- گێ ڕەپە: نەخۆشیی (ملەخڕێ)یە.
- گۆڕێ: (گۆڕەپان).

- گەوزی: بە ئاژەڵ دەگوترێ کاتێ لەسەر زەوی خۆی بە هەموو لایەکانی دا لە خۆڵ وەردەدات.
- گەززە: گازگرتن.
- گرسەر: جۆرە خۆڵێکە وەکو دەرمان بۆ خۆ شوشتن بەکاردێ، هەروەها قژیشی پێ دەشۆردرێ.
- گجیلۆکە: بە منداڵی بچوك دەگوترێ وەکو یاری کردنێك لەگەڵی .
- گروازە: (پرچی لوولە).
- گوفەك: کەڵەکە بوونی پیسایيە لە دەرەوەی دەوروبەی گوندو شارو گەڕەك.
- گورێ: ناوی ئافرەتانە.
- گەرحە: ناوی ئافرەتانە.
- گوستان: ناوی ئافرەتانە.
- گاگۆرە: دەسپێکی جوولەی منداڵی ساوایە لەسەر دەست ڕۆیشتن و خشینی لەسەر زەوی.
- گرمخا: شتێ شێ لێی دابێ و بۆنی ناخۆش بکات.
- گەمبۆر: جوێنێکە، بەو پیاوە پیرە دەگوترێ کاتێ ئیشێکی خراپ ئەنجام دەدا.
- گورگە لۆقە: غاردانی هێواش بە هەڵبەزە.
- گیزان: ئامێری ڕیش تاشینە.
- گێ ڕەپە: گوێ ئەستووربوون، نەخۆشیەکە.
- گەلحۆ: جوێنێکە، بە پیاوی گێل دەگوترێ، کەم عەقڵ.
- گنجی: ناڕێکی و تێکەڵ بوونی قژ (پرچ)ە.
- گونە پشیلە: ڕووەکێکی ڕەنگ پەمبەیی خرە، وەك (کەلا) وایە دەخورێت.

- گیشە کێش: ئەو ئافرەتانەی کە لە دوای سەپان (سواڵە درویێنە کراوەکان)کۆ دەکەنەوە.
- گەڕ: ١- گۆڕەپان ٢- گێژ، هێڕ ٣- ناشیرین.
- گەلاوێژ شارا: کۆکردنەوەی (مەلۆی جۆیە) سەرەو ژێر، (مەلۆی گەنم) یش سەربەرەو ئاسمان.
- گونە گیسك: بە مرۆڤی کورتە بالا دەگوترێ.
- گێرە: کوتانی (قرشەی جۆخینە) بە هۆی (وولاخ) یان (جەنجەڕ).
- گوزەر، کوزەر: گوڵی باش نەکوتراوی (گەنم و جۆ) یە.
- گوری ڕووت: جۆرە گەنمێکە بە دێمی دەڕوێت و دەچێنرێت.
- گەنمە حۆلە: (مزاش و جۆ و گەنم) ی تێکەلاوە.
- گێسوانە: ئەو تارمە زیادەیە کە لە پێشەوەی خانوی قوڕ هاتۆتە دەرەوە.
- گوڕی کردێ: بۆی چوو، پڕی پیاکرد، هێرشی کردە سەر.
- گێژو قەومت: سو پا، لە (جیش و قوە) وە هاتووە.
- گەنەگەرچەك: جۆرە گیایەکە، ڕۆنی زەیتی لێ دەردەهێنرێت.
- گرێ کۆرە: پەتێك، گوریسێك، پەڕۆکێك کە گرێ بدرێ و دواجار ئەو گرێیە نەبێتەوە (نەکرێتەوە).
- گازاندە: گلەیی، ڕەخنە.
- گەمان، گەمە: یاری، وازی لە (game) ەوە هاتووە.
- گێژ: هێڕ.
- گێـژەن: شـوێنێکی زۆر قوولـە لـە نـاو زێ (ڕووبـار)، ئـەم شـوێنە بـە هـۆی سوڕانەوەو خولانەوەی ئاوەکەوە بە دەوری یەکتری.
- گەندە: شتی خراپ و بێ سوود.
- گۆنگەر: گێچەڵ، شەڕفرۆشتن.

- گەراوێژکە: باوەشك هاتنەوە.
- گەجەرو گوجەر: بە مرۆڤی بێ سوود دەگوترێ.
- گودانەی دڕایە: بەو منداڵە ساوایە دەگوترێ کە ڕۆژانە پیسایی دەکا.
- گازەرەی پشتێ: ڕاکشان (درێژبوونە) لەسەر پشت.
- گێی کاس بوو: کەڕبوو، گوێی لە هیچ دەنگێك نەبوو.
- گری کەوە: خڕی کەوە، گردی کەرەوە.
- گومگومە: مەسینەی (قاوە) یە.
- گێلمەگێلم: ئەم لاو ئەولا، شتی تر هیچی تر.
- گێ چەرخە: دارێکی دوو لقە، چەرخی کارێزی لەسەر ڕاگیراوە.
- گێ ڕەپە: نەخۆشییەکە تووشی گوێ دەبێ، بناگوێشی لەگەڵدا دەپەنمێ و ئەستوور دەبێ و ئێش و ئازاری هەیە.
- گرناغە: سووربوونە لەسەرشتێك.
- گرکە: جۆرە خورشتێکە تووشی ئاژەڵ دێت.
- گورز گورزانێ: جۆرە یارییێکە.
- گردە بڕ: بە تەواوی.
- گای بنە: بە کەسێکی کەتن کەر دەگوترێ، جوێنێکە.
- گای تەنیا خوڕ: بە کەسێکی خۆویست دەگوترێ.
- گوچیلك: گورچیللە.



- لە دەستی ڕاستاند: لەناو دەستی دەرهێنا.
- لە کارکارەی دا:
- لە کارتەی دا: } لە ژێرەوە بڕی یەوە، ئەلکی کرد، نەیهێشت.
- لۆمارێ بەهوردەیە: زۆربەری ئەو پیاوانە دەگرێتەوەکە بۆ ماڵەوەی خۆیان بە دیقەتن (ووردەن) و ئاگایان لە هەموو شتێکی ماڵەوە هەیە.
- لێی لە ڕك ڕاچوو: لێی تورە بوو، پێچەوانەی بەرامبەرەکەی جولایەوە.
- لەمەڕ: لە هەمبەر، سەربە.
- لێی چاتر تییە: لەمە باشتر (چاکتر) نابێ.
- لاستق: لاستیك.
- لێ لووس بووە: لێ ڕاهاتووە، کەسێك شارەزایی لە شتی پەیدا کردبێ.
- لچی هەرینا: منداڵی ساوا بەر لەوەی بگریێ.
- لێ خۆش داهاتییە: ئاوەهای پێ خۆشە، بە هەوەسی خۆی کار ئەنجام دەدا ئاوا فێربووە.
- لووشکە: جووتەی ڕەشە ووڵاخ.
- لرخەلرخ: ئەو دەنگەیە مرۆڤ لەکاتی نوستنییەوە لە قورگ دەری دەکات.
- لە عەوای دەیقۆزێتەوە: زۆری حەز لێیەتی.
- لەبن و بۆتکەوە:لە ڕەگ و ڕیشەوە.
- لەخرێنی، لە خورێنی: بەر لە نان خواردن، (کاتی برسیەتی).
- لۆلکەو دۆی خواردییە: بەکەسێك دەگوترێ زووزوو بەربێتەوە سەر زەوی.
- لەسەرمانگ ورۆژی خۆیتی: بە ئافرەتانی (دووگیان) دەگوترێ کە وادەی منداڵ بوونی هاتبێ.

- لۆچ: ١- بۆچی، چی دەوێ. ٢- خەت دروست بوونە لە دەم و چاو.
- لە خۆی خەنی: بەو کەسە دەگوترێ کارێکی (خۆشی) ئەنجام دابێ.
- لە تەقەلۆ هاتتیتە دەرێ: بە کەسێك دەگوترێ لەشی زۆر سوتابێ.
- لە گەر گەردی بەیانیان:
- لە سۆری سبەینێ: } سپێدە (بەیانی) زوو.
- لاتەکی عەرد گرتییە: بەکەسێك دەگوترێ لە ژوورێکداو لە کاتی دانیشتن دا شوێنێکی فراوانی داگیرکردبێ .
- لووسکە: بە (مێرد منداڵی) پیست سپی دەگوترێ.
- لەو قاعیدەی : بەم جۆرە، بەم شێوەیە، لە (لەوقاعدە) وە هاتووە.
- لۆکس: ئامێرێکی ڕووناك کەرەوەیە.
- لچەستوور: لێو ئەستوور، جوێنێکە.
- لە زیندەی دا: برینداری کرد.
- لێ بترازێ: لێی بچێتە دەرەوە، لەگەڵی دا نەبێ.
- لباد: ١- ڕایەخێکە لە مووی ئاژەڵ دروست دەکرێ. ٢- بەوپیاوە دەگوترێ کە لە ژنەکەی بترسێ.
- لە خۆت غەریبێ: بە کەسێکی کەم زان و بێ دەسەڵات دەگوترێ.
- لە قیسی چوو: لە کیسی چوو.
- لە بای غارێ: هەر زوو، لە ڕێگاوە، ئیشێکی بە پەلە.
- لە خۆت قەلەندەرێ: بە کەسێکی نەزان دەگوترێ.
- لەبەر ڕا: لە سەرەتاوە، لە دەسپێکەوە.
- لێکاولێك: هەر هەمووی.
- لێرکوانە، لێرەکانە: لێرە.
- لەبەر دەوی ڕاست دەبیتەوە: بێ ڕێزی بچووکە بەرامبەر گەورە.

- لە بنی هینا: بە کەسێك دەگوترێ ماڵ و سەروەت و سامان بە کەسێکی ترەوە نەهێڵێ.
- لەسەری زەوقی دا: زەوقی تێکدا.
- لۆقنتە: ئوتێل، فندق، ووشەیەکی بیانییە.
- لەسەرەخۆی کردیتە مار: بەو کەسە دەگوترێ خۆی تەحەممولی ئەو شتە بکات.
- لە هیکرا: لە ناکاو، لە پڕێکا.
- لێکرا: پێکەوە، بەیەکەوە.
- لە برای کێوە؟: برا هەر برایە هەر چۆنێك بێ.
- لە ئاوێی کرد: دۆڕا.
- لەو زگەش قوتار بوو: ئەو جارەشیان لەو (کێشە) یا (ئیشە) ڕزگاری بوو.
- لاقی لە دوو نایێ: بە یەکێك دەگوترێ لەبەر (ماندووبوون) و (هیلاکی) و (ترس) نەتوانێ بە باشی بڕوا.
- لەودە: ئەو شوێنەیەکە (کا) ی تیا دەکرێ.
- لەو عەردانە: لێرە، لەم شوێنە.
- لە گوێی گای نووستی یە: ئاگای لە هیچ شتێك نییە.
- لەبەرت مرم: بۆت بمرم، بە قوربانت بم.
- لە علی: ناوی ئافرەتانە.
- لە تامی بردتە دەرێ: بە یەکێك دەگوترێ زیاد لە پێویست کارێ ئەنجام بدات.
- لە قەدەرە خۆی نییە: کەسێکی ئاسایی کارێکی گرنگ و گەورە ئەنجام بدات.
- لاقۆزە: کاڵەك (گندۆرە) ی خوارە.

- لۆقێ: بە کەسێکی (بەژن و بالا درێژ) دەگوترێ.
- لە درۆی نێم: درۆ دەکات.
- لێکیان کەوە: ۱- ناوبژیوانیان بکە ۲- جودایان بکەوە.
- لەزگە: خەریکە.
- لە خێوت بەم: جوێنێکە.
- لە خۆی دەخەفتی: گرنگی بە خۆی دەدا، خۆی جوان دەکا.
- لەگەن: قاپی گەورە یە.
- لەنگەری: قاپی پەل، بۆ (پلاو) بەکاردێ.
- لەڕ: بە ئاژەڵی لاواز دەگوترێ.
- لە سەری کەوە: بە هاناوە چوون و یارمەتی دانە لە کاتی شەڕ.
- لەبەر خۆف خوای: لە ترسی خودا.
- لەخۆچوو: بوورایەوە.
- لەبنی کودیدا: ۱- هەڵی هێنا، پێکاندی، بەو کەسە دەگوترێ کە قسەیەکی بەرامبەرەکەی نەبیستبێ و دواجار بزانێ چی گووتوە. ۲- هەرچی نهێنی هەبوو درکاندی.
- لەو هەرێمەی دیار نییە: لەو شوێنە دیار نییە.
- لنگاوگۆڕ: تاکەو تاك، پێلاو لە پێ کردن بە پێچەوانەوە.
- لە سەنعەکینە: هاوتەمەنن.
- لە نێژیانەوە: لە کاتی نوێژی بەیانیانەوە.
- لێرەوهیوە (هەوە): لێرە بە دواوە.
- لە تەرەف: لەلایەن.
- لە حیفزی خوای دابی: خوا ئاگادارت بێ .
- لەسەر چینچکان: دانیشتن لەسەر هەردوو پێ.

- لەسەر دەگ دەگە: زۆر نزیکە شتێك ڕوو بدات.
- لێی بوویتە مووی شەیتانی: یەکێك نەهێڵێ ئەوەی بەرامبەری کارێك بۆخۆی ئەنجام بدات.
- لە عەژمەتان: لە خەفەتان، لە داخان.
- لە تامی بردتە دەرێ: بێ تامی کرد، وازناهێنێ.
- لەسەر لاگونەکی پاری دایتەوە: یەکێك بێ شەرمانە، لە مەجلیسدا لەسەر لایەکی پاڵ کەوتبێ، ڕاکشابێ.
- لەو گۆڕەی: لە خۆڕایی، بەبێ هیچ هۆیەك.
- لەخۆت هەردە: جوێنێکە.
- لەسەر زەین نەبوو: ئاگادارنەبوو، ئاگای لێ نەبوو.
- لەسەر پتی قسان مەکە: ئەم ڕستەیە لەکاتی یاریکردن بەکاردەهێنرێ، مەیشڵەژینە، مەیشێوێنە.
- لە ڕایی خوای: بۆ خاتری خوا.
- لێی هەروتییە: وازی لێ هێناوە.
- لێی ستاند: لێی سەند، لێی وەگرتەوە.
- لێی هەردەگەڕێتەوە: کاتێ بچووك قسە لە قسەی گەورە بکات و بەرامبەری بوەستێت.
- لەمێژە: لە کۆنەوە.
- لە غەم، بن لەغەم: شوێنی (تونێڵی جۆگەی ئاوی کارێزە) .
- لێی هاویشتیتە ملان: کەسێك بیانوو بە کەسێکی ترەوە بگرێ.
- لێی بگرەوە: بابەس بێ.
- لێژ: خواروو.
- لە شەرمەترپیان: بەکەسێکی (خەجاڵەتبار) دەگوترێ.

- لە کۆری کەوە: مەیهێڵە فرێی دە، بیفرۆشە.
- لێی خافر مەبە: غافڵ مەبە لێی، ئاگات لێی بێ.
- لە ڕندەی دا: زۆری بریندار کرد، نەیهێشت.
- لەبارچوون: ئاژەڵ لەکاتی (زایین) دا.
- لوا: بریتییە لەو خورییە نەرمەی کە ڕیستراوە.
- لە پەلو پۆکەتییە: لە دەست و پێ کەوتووە.
- لێی نەهاتییە: بەو کەسە دەگوترێ دەردێکی کوشندەی توش ببێ و بمرێ.
- لاتەلقەوچ: } لاتەریب.
- لاونیو: } لاتەریب.
- لە قەوام دەرچوو: لە ڕادە بە دەرە.
- لۆلەپ: دارێکە لە (مەشکە) دەبەسترێ بۆ ئەوەی ئافرەت دەستی پێوە بگرێ لە کاتی مەشکە هەژاندندا.
- لەو دەقەی: بەم جۆرە، بەم شێوەیە.
- لە گوری جوانتری پێ نەگۆترایە: لە قسەی چاك بەو لاوە پێی نەگوتراوە.
- لە خرتۆرێی وەردا: لە تۆزو خۆڵی وەردا دای بە زەوی.



- مڕ دامایە: بە یەکێك دەگوترێ بیر لە شت بکاتەوەو دالغەی هەبێت.
- مۆری زادی نەکردیە: هیچی نەخواردووە.
- مرۆت: ناوی ئافرەتە، لە (مروە) وە هاتووە.
- مردۆخ: بێ هێزو لاواز لە کارکردندا، بێ دەسەلات.
- مێغنجیر: زنجیرێکی گەورەو درێژە ڕەشە وولاغی پێ دەبەسترێتەوە.
- مژانە: پارچە دارێکی باریکی قەبارە ناوەندە، (نیر)ی سەر کەرو هێستری پێ ڕادەگیرێ.
- ماچە: بە (مێ) یەی گوێ درێژ دەگوترێ، بەتایبەتیش (مێیەی هێستر).
- مەگەم: ئەگینا، دەنا.
- مارەوەدان: ماڵ ئاوەدان.
- مەینە: مەهێنە.
- مارت گۆرو هۆر بیتەوە: ماڵت وێران بێ، دوعا کردنێکە.
- مالۆس: بە (مێیەی بەراز) دەگوترێ.
- مەغدور: ماف خوراو.
- مووخە: بە کەسێکی (نابوت) دەگوترێ.
- مۆنجەی دێ: بە شوێنێکی (قەڵەباڵغ) دەگوترێ.
- مقەسە: جۆرە گیایەکە.
- مێوژێ سەربوکێ: بەسەرداکردنی نوقڵ و شیرینی بەسەر(بووك وزاوا).
- مەهاجە: سەردانی نەخۆش و بەندکراو، لە (مواجهە) وە هاتووە.
- مشت و مڕ: گفت و گۆیە لەسەر کێشەیەك.
- مام سەبرۆکە: بە مرۆڤی هێمن و لەسەرخۆ دەگوترێ.

- مەحچەچە: ڕووەکێکی دڕکاوی تیژە، بەرەکەی (تفتە) بۆ نەخۆشیی (گەدە) بەکاردێ.
- مجێور: بەو پیاوە دەگوترێ کە بەردەستیی مزگەوت دەکات.
- مێروانێ: یارییەکی مندالأنە.
- مەتکەبلی: قوتابی.
- مامەر: ناوی پیاوانە.
- مجرۆ: کۆرە.
- مەشکە: لە پێستی ئاژەڵ دروست دەکرێ و دۆی تیا دەهەژێنرێ.
- مەترەق: دارێکی کورتی ئەستوورە.
- مێراب: کەنار، ڕۆخ، قەراغ، لێوار.
- مەنگۆز: جوێنێکە.
- مەرۆ: گوڵەکانی (گەنم و جۆ) یە.
- متفەڕك: پارچە قوماش (پەڕۆ)ێکی ڕەنگ سەوزە لەسەر گۆڕی پیاوچاکان هەڵواسراوە.
- مەقری: شتی لەسەر سوور دەکرێتەوە، لە (مقلی) وە هاتووە.
- مقەوا: مقەبا.
- مەنیج: ناوی ئافرەتانە.
- مامزە: بریتییە لەو ئاسنەی دەکەوێتە لای سەری (قەڕاسە).
- مەحس: داوی لە (چەرم) دروست کراوە.
- مەیشێرەوە: وونی مەکە، پەنا (دالدە) ی مەدە، مەیشارەوە
- مەسرەتی: چارەسەرکردنی کێشەی نێوان دوو خێزان یا عەشیرەتە.
- مەرگەمووش: جۆرە ژەهرێکی کوشندەیە.
- مەراق: پەرۆش.

- مەعلان: شارەزا، لێزان.
- مزیر: شەڕانگێز.
- منجڕ: بە مرۆڤی هاروچیرە درێژ دەگوترێ.
- ملەك: کاتی بڕینەوەی خوری و توکی (مەڕو بزن) هەنـدێك لـەو (خـوری و تووکە) لەم لاو ئەولای (گوێکانیان) بۆ جوانی دەهێڵنەوە.
- مێکۆك: جۆرە دارێکە لە قەراغ ڕووبار دەڕوێت، خـەڵك بـۆ دروست کردنـی ((سابات)) کەپر بەکاری دەهێنن.
- مردی سەر دنیایێ: بەو مرۆڤە دەگوترێ هەردەم نەساغ و لـە دەسـت و پـێ کەوتبێ.
- موتەسەڕڕیف: پارێزگاری شار.
- مەزرا: ئاوەڕۆ، لە (مجری) وە هاتووە.
- ملهور: گێژ، هێر، گوێ نەدان بە هیچ شتێك.
- مندارەکەت زراو بردی کرد: مندالەکەت ترساند .
- مەیگەینە مریشکە ڕەشەی: بانەبێتە شەڕو ئاژاوە.
- مەزەندە: بۆچوون.
- ملەوەز: ملەستوور، بەمرۆڤی چوار شانە دەگوترێ.
- مەلۆتکە: بە منداڵی تازە لە دایك بوو دەگوترێ.
- مامە سەفەرە: بە مرۆڤی گەڕۆك دەگوترێ.
- مەشقەرە: مەشخەڵی ئاگر.
- مار خەرا: ماڵ وێران (خراپ) .
- مارات: ئاژەڵ.
- مقەرتە: مووکێش .
- مزمزۆك: گیانەوەری (بزن مشك) ە.

- مەلۆ: کورت کراوەی ناوی (مەولود)ە.
- مەهاندز: ئەندازیار، لە (مهندس)ەوە هاتووە.
- مزاش:تێکەڵ بوونی (گەنم و جۆ) یە ئینجا لە ئاش دەیکەنە ئارد.
- مەڕەزا: ئەو کاتەیەکە (مەڕ) دەزێ.
- مەیاس: ناوی ئافرەتانە.
- مـژمرك: کەسـێك واز لـە کەسـێکی تـر نـەهێنێ، هـەروەکو (قیروبنێـشت) پێیەوە. بنووسێ.



- نسێ: نسار، نزار، سێبەری سەر لە ئێواران.
- نیر: ئەو پارچە دارەیەکە لەسەر ملی هەردوو وولآغ دادەنرێت دەکەوێتە ژێر کۆپەران (بارێنە) وە، تا وەکو ملی وولآغەکان بریندار نەکات.
- نانانە: ئەو (گەنمە) یە کە دەدرێتە (شوان و سەپان و جوتیار) لە کاتی دامەزراندنێ لەلای هەر کەسێك کە دەبێ بە (ئاغای) برا گەورەی، بۆ ئەوەی بیکات بە ئارد بۆنانی خۆی بە مەرجێ بەشێ ئەو ماوەیەی بکات تاشەرتەکەی کۆتایی دێت.
- ناودار (ناودۆك): دارێکە بە درێژایی مەشکەیە، بەسەر سکی (مەشکەکەدا) دەپێچرێ لەگەڵ هەردوو لۆلەپەکاندا.
- نام: کورت کراوەی ووشەی (نازانم)ە.
- نوردی نان: (٥-٦) نانێکە بەیەکەوە تەڕ دەکرێ و دەق دەکرێ.
- نێردەوان: قالدرمە، پلیکانە.
- نێرەمووك: نە ژنەو نەپیاو.
- نەیهێشت بەدری گەوی: بەو کەسە دەگوترێ کە نەهێڵێ یەکێکی ترتام و چێژ لە خواردنی یان شتی وەرگرێ.
- نو : نوێ، تازە.
- نەوسی هەند گەورەیە!: بە مرۆڤی (نەفسن) دەگوترێ .
- ناحەجمێ: نا حەوێتەوە.
- نەبان: ئەو (مەڕە)) یە کە نەهێڵێ (بەرخەکەی) شیری بمژێ.:
- نەدیتی و نەناسی: کەس نەیبینیووەو کەسیش نایناسێ.
- نێزیکە بەرا: بەو کەسە دەگوترێ هەردەم لە (بەلآ) وە نزیکە.

- ناچتە ئاویٚ: مەبەست لەو جۆرە قوماشەیە گەر بشۆردریٚ کورت نەبێتەوە.
- نەبیٚ یەك دەتوانن نە لەگەر یەكدیش هەر دەكەن: دووكەس لەگەڵ یەکتر زۆر هاورِیٚ بن لە هەمان کاتیشدا زۆریش بەشەرِ بێن.
- نوقفەی ناکا: هیچ قسەناکا، بیٚ دەنگە.
- نوزەی لیٚ برِایە:
- نوزەی لێوە نایێ: } بیٚ دەنگە، بووراوەتەوە، لە هۆش خۆی چوو.
- نۆبەتەگارِان: هەر رِۆژە نۆرەی یەكێك بیٚ لە (گاوان)ی کردن.
- نەڤیزە: زەختە، لیٚدانی گویٚ درێژە بەسەری نووکی پێشەوەی دار.
- ناوبرِە: ١- دیواری نێوان دوو ژوورە لە یەکتریان جودا دەکاتەوە.
  ٢- ماوەیەکی کورت.



- هەرامە: هین، ئەوە، وانەك.
- هەڕنەهوت: بە یەکێك دەگوترێ قسەی لەگەڵدا نەکرێ.
- هیشکە بیرۆ: ووشك بوونی پێستی مرۆڤە لە زستاندا.
- هەندی جووەکی هەیە: بەکەسێکی دەوڵەمەند دەگوترێ.
- هەویری هەراتە: (هەویری ئامادەکراوە)، بەباشی دەکرێت بە (نان).
- هەر بابایە: (کەس بە کەسەوە نییە).
- هەی هوو هەی هوو: چۆن وا دەبێ.
- هۆش:١- بۆ ڕاگرتنی (گوێ درێژ) دەگوترێ لە رێگا ٢- هزرو بیر.
- هووردو هەڕا: شکان.
- هیربار: قاپ و قاچاغ.
- هەیتە: ١-بە کچ و ئافرەتی (هار) دەگوترێ ٢- شورتە.
- هەی ڕووت ڕەش بێ: جوێنێکە.
- هیشك و بریشك: ووشك.
- هەست و خوستی نییە: بێ دەنگە.
- هەرەتە بووە: بەرەڵلاّ بووە، هەلآتووە.
- هەربەزو دابەز: بەرزی و نزمی.
- هاتیتەوە سەرەخۆ: بە یەکێك دەگوترێ لە بێ ئاگایی بە هۆش خۆی بێتەوە.
- هڕی لە بڕی ناکاتەوە: بە کەسێك دەگوترێ لە هیچ شتێك نەگەڕێتەوە.
- هەتا بن پیلان زەرەری کردییە: بە کەسێك دەگوترێ لە مامەڵەدا زۆری زەرەر کردبێ.

- هەر تەققەی سەری دێ: کەسێك کارێکی پێ سپێردراو دواتر ئەو کارە پشت گوێ بخات و ئەنجامی نەدات.
- هەناوی لۆی سووتایە: بە زەیی پیادا دێتەوە، خۆشی دەوێ.
- هەری کۆرە: هەڵی کەنە.
- هۆپ بە: ڕاوەستە.
- هەر پشافتن: خاوێن کردنەوەی پیسییە لەسەر جل و بەرگ.
- هەر تورتکایە: بەو (سەگە) دەگوترێ لێی پاڵ کەوتبێ بە (کرێ).
- هەرکشێ: بۆ سەرەوە (ژوورتر) برۆ.
- هەناسە برکێ: تەنگە نەفەسی.
- هەڕشتە: جۆرە خواردنێکە.
- هەوەنتە: بە خۆڕایی، گاڵتە، فشە.
- هەلیکانی: جۆرە یاریەکە، (هەلوکێن)، مێرد منداڵ ئەنجامی دەدەن.
- هورەبا: بای گەرم.
- هێرنج: بەر لە (ڕشانەوە)ی مرۆڤ، هێڵنج.
- هەلیکسە: جۆرە هەڵپەڕینێکە منداڵ لەکاتی یاریکردنـدا دەیکەن و دەڵێن: هەلیکسە ئەمن و ئایش دەرپێ قایش.
- هەنجەت: بیانو.
- هەتیمە سە: جوێنێکە.
- هۆڕین: ئاگادار کەرەوەی ئۆتۆمبێلە، لە (horn) ەوە هاتووە.
- هێرەگ: هێڵەگ، ئاردی پێ دەبێژرێ.
- هەیرۆ: ئەیەڕۆ، کاتی بیستنی هەواڵێکی (سەیر) یان (ناخۆش) لەلایەن ئافرەتانەوە.

- هەمبانە: لە پیستی ئاژەڵ دروست دەکرێ، دانـدۆك و کەشـك و ساوەری تیادادەنرێت ودەکرێ .
- هەسان: ئامێرێکی تیژکەرەوەیە، لە بەردی زوورگ دروست دەکرێ.
- هەمێز: ئامێز.
- هەڕوو: بڕۆ، بچۆ.
- هەباشە: پەلکی (گەنم و کونجی) ی پێ لێ دەکرێتەوە.
- هەڕو گیف: هەڕەشە.
- هەری گرۆفە: خاوێن کردنەوەی (لەکە) (ماك) ی سەرجل و بەرگە.
- هێتیم: بە منداڵی بێ دایك و باوك دەگوترێ.
- هەوێز: ئەو شوێنەیە (پشقلی مەڕومالآتی) تیا خڕ دەکرێتەوە.
- هەنگافت: لێدان، ئازار.
- هەر کروزایە: کاتێ (موو) دەسووتێ.
- هانکە هانك: ئەو مرۆڤەی لەبەر ماندوبونی قسەی بۆ نەکرێ.
- هاوێر: ئەو کاتەی (بەرخ و کار) لە دایکەکانیان جودا دەکرێنەوە.
- هوور: وورگ.
- هڕ: بۆ لێ خوڕینەوەو (هاژوانی) مەڕ دەگوترێ.
- هەتا هەنگری هێشا خواردی: زۆری خوارد.
- هەندەی نایێ: ئەوەندە ناهێنێ.
- هەجەل: ئەجەل، وادەی مردن.
- هەچەتوو: بۆ (هاژوان) ی گوێ درێژ دەگوترێ.
- هەر هەویلێ: وەکو ئەوە، شێوەی ئەو دەکات.
- هیزە: لە پیستی مەڕ دروست دەکرێ، (ڕۆن)ی تیا دەکرێ.
- هەردوو چاوت بە برقی دۆی بی: هەردوو چاوت کۆرەبێ، دوعاگردنێکە.

- هێوێن: هەوێن.
- هەرێی پێ دابوو: بەڵێنی پێ دابوو.
- هەرکەسەو سواری کەری خۆی بی: هەر کەسە بە جودا پارەی خۆی بدا.
- هەراوهوریا: دەنگەدەنگ، هەڵلا.
- هەری دایە: بالآی بەرزبووە.
- هەیوان: تارمە.
- هەواری نوتان پیرۆز: بەو خێزانە دەگوترێ کە (تازەڕۆیشتنە ناو خانووەکی نوێ)وە.
- هەر زێنەتە تەماشای کەی: زۆر خۆشە لە تەماشاکردنی شتی جوان .
- هارە پاس: هاروهاج.
- هەر ساردی ناکاتەوە: بەو کەسە دەگوترێ (جگەرە) زۆر بکێشێ.
- هەری کوتاسەری: هێرشی کردە سەر.
- هەروەستەکی کرد: کەمێك ڕاوەستا، پشوێکی وەرگرت.
- هەورو هێر: هەوری ڕەش.
- هەری بڕی: ڕاوی نا، بە دوای کەوت.
- هەر زەلی: خلیسکی برد، کەوت.
- هەوەنتە: بە ئاسانی.
- هیشکە کەرەك: ئەو دیوارەیە کە بەبێ (چیمەنتۆ یاخود قوڕ) لەسەریەك دادەنرێ.
- هەرتەکایە: هەڵوەشاوەتەوە، لێ بۆوەتەوە.
- هەمین: ناوێکی ئافرەتانە.
- هەیاسە: کەمەرەیەکی لە زێر لە زیو دروست دەکرێ، ئافرەت لە پشتی خۆی دەبەستێ.

- هەش بەسەر: جوێنێکە، ئافرەت بەکاری دێنێ.
- هەنگینێ: ئەوسا، ئەوکات.
- هەرچی و پەرچی: بە مرۆڤی خراپ دەگوترێ.
- هەری بێنجا: ئاوی لە (بیر) دەرهێنا.
- هەنجن هەنجنی کرد: پارچە پارچەی کرد، هەلاهەلای کرد.
- هەنکە، هەنووکە، هەونەکە: ئێستا.
- هەچی پێیان: هەستە سەرپێ، بە منداڵی ساوا دەگوترێ.
- هەوێ: دوو ئافرەت هاوسەری پیاوێك بن.
- هەوگیان: (براژن).
- هەیپێی لێ کرد: هەڵسا ڕۆیشت.
- هەروا بێتەوە: هەروەها.
- هەر تەقەی سەری دێ: بە خەیاڵی دا نایێت، گوێی پێ نادات.
- هەرکوەکی بی: هەر چۆنێك بێت.
- هەیهوهەیهو: بەو کەسە دەگوترێ زۆر لەسەر بابەتێك بڕوات.



- وەرکەتییە: کاتی حەسانەوە پاڵ کەوتنی (سەگە).
- وولاش زاوا: ئاوەڵ زاوا.
- ووسکت بە: بێ دەنگ بە، کڕبە.
- وجاغ کۆر: بەو پیاوە دەگوترێ منداڵی نەبێ.
- وەیلۆ: بە منداڵی (هەژار) دەگوترێ.
- وەکی سەی پێ سوتای دێو دەچی: بە مرۆڤی (گەڕۆك) دەگوترێ.
- واقی وڕمایە: سەری سوڕماوە.
- ونس (ونە): کورت کراوەی ناوی (یونس)ە.
- وەیسی: ناوی پیاوانە.
- وازەنی: جۆرە مەرهەمێکی کۆنە بۆ پیستی مرۆڤ بە تایبەتی قلیشان بەکاردێ.
- واسیدە: بە هۆیەوە، لە (واستە) وە هاتووە.
- وەرە بەرێ: وەەر بەرامبەرم، کاتی شەڕکردن دەگوترێ.
- وا ماینەو: وا (ماوین) لە ژیاندا.
- وەچە: نەوە.
- وەی مەپرسە!: وانییە، ڕاست نییە.
- وەکی پشتی برنۆی ڕاستە: بە قسەی ڕاست و دروست دەگوترێ.
- وێروە وەرە: نزیك بەوە.
- وور وورە: بە هێلکەی بچووك بچووکی ناو سکی باڵندەو پەلەوەر دەگوترێ.
- ووشی: هێشووی ترێ.
- وورگەستوور: وورگ زل.

- وەی دەستت لەوەی: بە کەسێك دەگوترێ لەکارێکدا بە هەڵەداچووبێ.
- وەری گەڕێیێ: لێ یدە، تێی هەڵدە.
- وەهاوە ڕۆی: بەم لایەدا ڕۆیشت، ئاوا ڕۆیشت.
- وەکیلی (وەکیدی) سەلامان بە: لە جیاتی من سڵاو بگەیەنە.
- وەلحاسر: ئەووەی (ماوە) (مابێ) لە (والحاصل)ەوە هاتووە.
- واربۆوە: گریا.
- وەڕز بوو: بێزار بوو.
- وەی بابەکە ڕۆ: وای باوکە ڕۆ.
- وەللای: وەرە ئەم لاوە، لاچۆ.
- وا بەپێی خۆی هات: کاتێ خەڵکانێك چاوەڕوانی کەسێك دەبن، لە ناکاو ئەو کەسە دەردەکەوێت.
- وەرد: ئەو زەوییەیە دووجار گاسنی لێ درابێ، ئینجا گاسنی سێیەم لەگەڵ (تۆو) وەشاندندا.
- ووردە کوت: کوتانی دووەم جاری (گەنم و جۆ) یە.
- وەرزێر: ئەو ڕەنجبەرانەن کە دروێنە دەکەن.
- وەکی کابرای گۆتی (گۆتەنی): (کابرا وتەنی).



- یەکدی گربوینە: گردبوونەوە(بەیەك گەیشتنی) دووکەس یان زیاتر.
- یاریی کە: یارمەتی بدە.
- یەك قامك: یەك دەستە، کۆمەڵێك.
- یەکەکیتکە، یەکەکی دی: یەکێکی تر.
- یەختە: پیرە ئەسپە.
- یەك بە دەل لە بەریتی: بەو کەسە دەگوترێ بە بەردەوامی یەك جۆرە جل و بەرگ لەبەر بکات.
- یاغر یاغر: هێواش هێواش، لەسەر خۆ، هێدی.
- یێوەڕۆ: بڕۆ ئەو لا.



* نیاز عەبدولقادر محەمەد .

* لەساڵی ١٩٦٥ لە گوندی (شەناغە)ی سەر بەناحیەی کەندیناوە لەدایک بووە.

* دەرچووی پەیمانگای مامۆستایانە ساڵی ١٩٨٣- ١٩٨٤ هەولێر.

* ئێستا مامۆستای زمانی ئینگلیزی یە لەقوتابخانەی (بزاڤی بنەڕەتی) لەشاری هەولێر.




چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری/ هەولێر

www. kurdchap. com